کۆماری عێراق
وەزارەتی ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندن
دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی
زنجیرەی ژمارە (١٤١)

نوری عەلی ئەمین

# ئەرك و شوێنی ڕاناوە کەسیەکان



# لە «ئاخاوتنی کوردی»دا

کۆماری عیراق
وەزارەتی ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندن
دەزگای ڕۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی
زنجیرەی ژمارە ( ١٤١ )

# ئەرك و شوێنی ڕاناوە کەسی یەکان لە «ئاخاوتنی کوردی» دا

نوری عەلی ئەمین

بەغداد ——— ١٩٨٦

# ســــەرەتا

ئــەم بەرهەمە زادەی بیری خــۆمەو ئەوانەیە کـــە لەپێش مندا قەلەمەکەیان خستۆتەکار بۆ خزمەتی زمانی کوردی ، بەبێ ئەوەی چاویان لە پارەو پوولێکەوە بووبێت .

ئەم بەرهەمەی من ناڵێم پوختەو بێ‌گەردو دوور لە کەموکووڕییە ، بەڵام دەتوانم بڵێم هەندێ کەلێنی‌ترم لە ناتەواوی‌یەکانی رێزمانی کوردی پڕ‌کردووە بەپێی توانای خــۆم .

نوری علی ئەمین
١٠ـ١٩٨٣ـ٥

# ئەرك و شوێنی ڕاناوە کەسی یەکان
# لە ئاخاوتنی کوردی دا

## بەشی یەکـــەم

## رانـــاوی کـــەسی

ڕاناو ووشـەیەکە لە زمانی کوردیدا ، دەورێکی گرنگ دەبینێت ، وە لەبری کەسێ ، یان شتێ بەکاردەهێنرێت لە ئاخاوتندا ، کەسەکە ، یان شتەکە دەشێت لەپێشـــــەوە ناوی هێنرابێت ، یـــان لە یاد دا بێت ، وەك :

**کاغەز ئەنووسم بە خوێنی دڵەکــەم**
**ئەیدەم بــە شـــەماڵ بیبـــا بۆ گوڵەکـەم**
**( فولکلور )**

لــە نیوە دێڕی دووەمی ئەم هۆنراوەیەدا ، لەبری ووشـەی ( کاغەز ) دوو جار ڕاناوی ( ی ) بەکارهێنراوە ، یەکێکیان لە دوای نیشـانەی ڕێژەی فرمانی ( ئەیدەم )و ئەویتریان لە دوای نیشـانەی ڕێژەی فرمانی ( بیبا ) ، بۆ ئەوەی ووشـەی ( کاغەز ) ئەوەندە دووبارە نەکرێتەوەو نەگوترێت :

**کاغــەز ئەنووسم بە خوێنی دڵەکەم**
**کاغــەز ئەدەم بە شـــەماڵ**
**کاغــەز بیبـــا بۆ گوڵەکـەم**

چونکە دووبارەکردنەوەی وشـــەیێک بۆ چەند جارێ لـــە رستەیەکدا جوان نی‌یەو رستەکە بە پەسەند دانانرێت .

راناوی کەسی لە ئاخاوتنـــدا بۆ جویَ‌کردنەوەی سێ کەســـەکە بەکاردەهێنرێت ، ئەم سێ کەسە ، تاك و کۆیان هەیە :

١ ــ **کەسی یەکەم** : ئەوەیە ، کە دەدوێت ، واتە ( بکۆ )یە ، وەك :

**من هەوای پاك هەڵدەمژم ( من ــ م )**

**ئێمە دژی دوژمن دەجەنگین ( ئێمە ــ ین )**

٢ ــ **کەسی دووەم** : ئەوەیە ، کە دەدوێنرێت ، واتە ( بژنەو )ە ، وەك :

**تۆ گـــوڵ دەچێنیت ( تۆ ــ یت )**

**ئێوە چیایان هەڵدەکۆلن ( ئێوە ــ ن )**

٣ ــ **کەسی سێیەم** : ئەوەیە ، کە لێی‌دەدوێین ، واتە ( بزر )ە ، وەك :

**ئەو زەوی‌یەکە بژار دەکات ( ئەو ــ ات )**

**ئەوان نەمامەکەیان ڕواند ( ئەوان ــ یان )**

راناوی کەسیش لە ئاخاوتنی کوردی‌دا دوو جۆرە :

١ ــ راناوی کەسی‌ی جویَ ، وەك لەم نەخشەیەدا دەرخراوون :

**نەخشـــەی راناوی جـــویَ**

| کەس | تاك | کـــۆ |
| --- | --- | --- |
| یەکەم | من | ئێمە |
| دووەم | تۆ | ئێوە |
| سێیەم | ئەو | ئەوان |

٢ ـ راناوی کەسی‌ی لکاو ، ئەم جۆرە راناوانە دوو وێنەن ، یان دوو کۆمەڵە(١) ، یان دووجۆرن :

ا ـ کۆمەڵـــەی A

ب ـ کۆمەڵـــەی B

ئەم دوو کۆمەڵەیە لە ئاخاوتنی کوردی‌دا ئەرکو شوێنی تایبـەتی خـــۆیان هەیە ، کە لە مەولا لێیان دەدوێین ، بەڵام بە نەخشــــە هەر کۆمەڵەیان دەخەینەبەرچاو :

**( ١ ) نەخشـــەی کۆمەڵەی A**

| کەس | تاك | کۆ |
|---|---|---|
| یەکەم | م | مان |
| دووەم | ت | تان |
| سێیەم | ی | یان |

(١) ا ـ مامۆستا وەهبی لە دەستووری زمانی کوردی‌دا ، ئەم راناوە لکاوانەی بەپێی ئەرکەکانیـــان لە رستەدا بە چەند نەخشـــــەیێك ، خستۆتە بەرچاو .

ب ـ من لـــە رێزمانی کوردی ـ چاپی ســـلێمانی ١٩٦٠ لاپەڕە ( ٩٠ـ٩٢ ) ئەم راناوە لکاوانەم کردووە بە دوو وێنەوەو بە نەخشـــــە پیشانم داوون .

ج ـ د. ووریا عمر امین لە ووتاری ( لایەنێکی جیاوازی ) کە لـــە گۆڤاری کۆڕی زانیاری‌دا بلاوی کردۆتەوە ، ئەم راناوە لکاوانەی کردووە بە دوو سێنەوە . سێتی A و ســـێتی B . ←

( ٢ ) نەخشـــەی کۆمەڵەی B

| کەس | تاك | کۆ |
|---|---|---|
| یەکەم | م | ین |
| دووەم | یت (ی) ، ە | ن |
| سێیەم | ێت ( ێ )<br>ات ( ا )<br>ت<br>.... | ن |

## یەکەم ـ راناوی کەسی‌ی جوێ

ئەگەر سەرنج بدەینە نەخشـەی ژمارە ( ١ ) لە لاپەڕە ( ٦ )دا ، دەبینـــین :

١ ـ راناوە کەسی‌یە جوێیەکان ، لە شـەش راناو پێك‌هاتوون :

ـــ سیانیان ( من ، تۆ ، ئەو ) بۆ کەسی یەکەم‌و دووەم‌و سێیەمی تاك لـــە ئاخاوتندا بەکاردەهێنرێن ، ئەم سێ راناوە **بنجین** .

ـــ سیانەکەی‌تریان ( ئێمە ، ئێوە ، ئەوان ) بۆ کەسی یەکـــەم‌و دووەم‌و سێیەمی کۆ لە ئاخاوتندا بەکاردەهێنرێن ، ئەم سێ ڕاناوەش **پەلکـن‌و** لـــە ڕاناوە بنجییەکان کەوتوونەوە .

---

→

د ـ دابەش‌کردنی ئەم راناوە لکاوانە لەژێر هەر ناوو نیشانەیەکدا بخرێنە بەرچاو لە دوو جۆر بەدەرنین .

٢ ـ ڕاناوەکانی ( ئێمە )و ( ئێوە )(١) بە شێوەیەکی ئاڵۆز لە راناوی ( من )و ( تۆ )ی تاکەوە کراوون بە ( کۆ ) ، بەڵام ڕاناوی ( ئەوان ) بە شێوەیەکی روون و ئاشکرا بە نیشانەی ( ان ) لە راناوی ( ئەو )ی تاکەوە کراوە بە ( کۆ ) .

٣ ـ بۆیە بەم راناوە کەسیانە دەگوترێت ( راناوی کەسی‌ی جوێ ) چونکە هەریەکەیان مۆرفیمێکی سەربەستەو قەوارەو واتایەکی سەربەخۆیان هەیەو بەتەنیا دێنەگوتن و دەتوانرێت لە ئاخاوتندا رستەیان پێ‌دەست‌پێ‌بکرێت ، وەك :

تۆی تیا نەبینم ویرانە ژینم
هەر تۆ ئەناسم هەر تۆیە باسم

راناوە کەسی‌یە جوێیەکان لە ئاخاوتندا ئەرك و شوێنی تایبەتی

---

(١) بەبیروڕای من وەك لە هەندێ شێوەدا دەبیسترێت لەبری راناوی ( من ) و ( تۆ ) دەڵێن ( ئەمن ) و ( ئەتۆ ) ، پێشگری ( ئە ) یان خراوەتەسەر . . ئەمانیش ( ئێمە ) و ( ئێوە ) دەبێت لە بنەرەتدا ( ئەمە )و ( ئەوە ) بووبن ، وە بۆ جوێ‌کردنەوەیان لە راناوی ئیشاری ، پێشگری ( ئە ) کراوە بە ( ئێ )و بوون بە ( ئێمە )و ( ئێوە ) ، وەك چۆن ( ئەساڵ )و ( ئەمڕۆ ) لە هەندێ شێوەی کوردی‌دا بوون بە ( ئیمساڵ )و ( ئیمڕۆ ) ، وە بەڵگەش بۆ زیادکردنی پێشگری ( ئە ) ئەوەیە هەتا ئێستاش شێوەی کرمانجی سەروو ، لەبری ( ئێمە )و ( ئێوە ) دەڵێن ( مە )و ( وە ) .

خۆیان هەیەو دەبنــە :

**١ ــ کــارا**

**٢ ــ جێگری کارا**

**٣ ــ بەرکاری راســــتەوخۆ**

**٤ ــ بەرکاری ناراســــتەوخۆ**

**٥ ــ تەواوکـــەر :**

**ا ــ تەواوکـــەری کارا**

**ب ــ تەواوکـــەری بەرکاری راستەوخۆ**

**ج ــ تەواوکـــەری بەکاری ناراستەوخۆ**

**د ــ تەواوکـــەری گوزارەی ناتەواو(١)**

ئەوا یەکـەیەکـە لــەم ئەرکانەی راناوە کەسیییە جــوێیەکان دەدوێین‌و شوێنەکانیان لــە رستەدا دیاری دەکەین . بەلآم بەر لەوەی بچینە سەر باســەکە ، هەندێ لــە رســتەی سادە لــە زمانی کوردی‌دا دەدوێین ، چونکە پەیوەندی بە باسەکەوە هەیە :

رستەی سادە لە ئاخاوتنی کوردی‌دا لــــە دوو بەش پێکدێت :

**١ ــ بەشی نیهــاد ( SUBJECT )**

**٢ ــ بەشی گــوزارە ( PRIDICATE )**

ووشەی گرنگ لــە بەشی نیهاددا ( کارا )(٢)یە ، بەلآم ووشــە گرنگ لــە بەشی گوزارەدا ( فرمان )ە . وە هەرچی لە ( کارا )و ( فرمان )

---

(١) یان تەواوکەری فرمانی بێ‌هێز ( ناتەواو ) .

(٢) ووشەی ( کارا ) زاراوەیێکی نوێیە کۆڕی زانیاری کورد لەبری ( مسندالیە ، مبتدا ، العامل ) دایناوە .

به دەربوو ، لە رستەدا پێی دەگوترێت ( سەربار )(١) . سەربارێش ، یان ووشەکانی بەشی نیهاد تەواودەکات ، یان ووشەکانی بەشی گوزارە تەواو دەکات ، بۆ وێنـــە :

**کەوەکـــەی من لەسەر کانییەکــە دەخوێنێت .**

لـــەم رستەیەدا :

— **کەوەکەی من** : بەشی نیهادی رستەکەیە .

**کەوەکـــە** : کارایە .

**ی** : ئامرازی پەیوەندییە .

**من** : راناوی کەسیی جوێیە .

**لەسەر کانییەکە دەخوێنێت** : بەشی گوزارەی رستەکەیە .

**لەســـەر** : ئامرازی پەیوەندی ناسادەیە .

**کانییەکـــە** : بەرکاری ناراستەوخۆیە .

**دەخوێنێـــت** : فرمانی رانەبوردووە . رانـاوی ( ێت )ی دوای رەگی فرمانەکە ، بکەرە .

× × ×

**رێکەوتنی ( کارا )و ( فرمان ) لە رستەدا(٢)**

( کارا ) لـە ئاخاوتنی کوردیدا ، دوو شێوەی هەیە :

---

(١) یاخوت ( تەواوکەر ) .

(٢) لە کتێبی ( رێزمانی کوردی ) چاپخانەی کامەران — سلێمانی — سالی ١٩٦٠ لاپەرە ( ٤١ ) لە رێکەوتنی ( بکەر )و ( کارا ) دواوم و هەندێ تێبینیم دەربارەی ئەم رێکەوتنە دەربریوە .

١ ــ شێوەی تاك ، وەك : قەلەكە فڕی ( قەلەكە )

٢ ــ شێوەی كۆ ، وەك : قەلەكان فڕین ( قەلەكان ) .

( فرمان )یش دیسان لە ئاخاوتنی كوردیدا دوو شێوەی هەیە :

١ ــ شێوەی تاك ، وەك :

گولەكە دەوریت ( دە ــ وەر ــ یت )

٢ ــ شێوەی كۆ ، وەك :

**گولەكان دەوەرن ( دە ــ وەر ــ ن ) .**

دەبێت ( كارا )و ( فرمان ) لە رستەدا هاوتابن ، واتا وەك یەكبن لە كەس و ژمارەدا ، ناشێت یەكێكیان تاكو ئەویتریان كۆ ، یان بەپێچەوانەوە ، چونكە لە كورد نەبیستراوە بلێت :

**پشیلەكە نووستن .**

**پشیلەكان نووست .**

ئەوەی لە كورد بیستراوە :

١ ــ ( كارا )ی تاكو ( فرمان )ی تاك ، وەك :

**پشیلەكە نووست .**

٢ ــ ( كارا )ی كۆو ( فرمان )ی كۆ ، وەك :

**پشیلەكان نووستن .**

ئەوەی « كارا »و « فرمان » هاوتا دەكات لە رستەدا راناوە كەسییە لكاوەكانە(١) ، وەك :

---

(١) د. ووریا عمر امین لە ووتارەكەیدا ( لایەنێكی جیاوازی ) ئەم راناوانە بە راناوی رێكەوتن دەداتە قەلەم .

**ســـــالار هەنجیرەکەی خوارد ( ی )**

**منداڵـــــەکان هـــاتن ( ن )**

— لە رستەی یەکەمدا ڕاناوی ( ی ) فرمانی ( خـــــوارد )و کارای ( ســـالار )ی لە کەس وژمارەدا هاوتاکردووە .

— لـــە رســـــتەی دووەمدا راناوی ( ن ) فرمانی ( هات )و کارای ( منداڵەکان )ی لە کەس‌و ژمارەدا هاوتاکردووە .

× × ×

**زاراوەی ( کارا )و زاراوەی ( بکەر ) :**

**١ ــ زاراوەی کارا :**

لە بەشی نیهادی رستەدا ، ناوێ ، یان راناوێکی جوێ ، دەبینرێت ، کـــە کارێ ، یان سیفەتێکی لـــە زەمانێکدا دراوەتەپاڵ پێی دەگوترێت ( کارا ) ، وەك :

| | |
|---|---|
| **شێرەکە نەڕاندی .** | **( شێرەکە )** |
| **هەنارەکە ترش بوو .** | **( هەنارەکە )** |
| **ئێمە لەلادێوە هاتین .** | **( ئێمـــــە )** |

**٢ ــ زاراوەی ( بکەر ) :**

لـــە بەشی گوزارەی رستەدا ، راناوێکی لکاو دەبینرێت ، ســــەر بە فرمانی رستەکەیەو ( کارا )و ( فرمان ) هاوتادەکات ، پێی دەگوترێت : ( بکەر ) ، وەك :

مـن(١) دەخـوێنم .　　( م )

دارەکان دەشەکێنەوە .　　( ن )

ســـیروان دەڕوات .　　(ات)

جیاوازی نێـــوان زاراوەی ( کارا )و زاراوەی ( بکەر ) لـــــە ئەرکەکانیـــاندایە :

١ ـ هەرچی ( کارا )یە ، لــە رســـــتەدا دەشێت ( نــاو ) ، یان ( راناوی جوێ ) بێت‌و هەمیشە دەکەوێتە بەشی نیهادەوە .

٢ ـ هەرچی ( بکەر )ە ، لــە رستەدا دەشێت هەر ( راناوی کەسی لکاو ) بێـت ، چ لـە کۆمەڵەی ( A ) یـان کۆمەڵـەی ( B ) وە ئەم راناوە لکاوانە جگە لەوەی دەبنـــە بکەر ، کاراو فرمانیش هاوتا دەکەن لە کەس‌و ژمارەدا .

لەدوا ئەمە دەگەڕێینەوە سەرباســـەکەو لـــە ئەرك و شـــوێنی راناوە کەسی‌یە جوێ‌یەکان لەرستەدا دەدوێین .

---

(١) مامۆستا وەهبی لە دەستووری زمانی کوردی‌دا دەڵێت :

ئەگەر راناوی جوێ‌و راناوی‌لکاو لە رستەدا پێکەوە هاتن ، راناوە جوێ‌یەکە بۆ تەئکیدە .

# ئەرکەکانی راناوی کەسیی جوێ

× × ×

## ١ ـ ئەرکو شوێنی کارا

## ( ١ )

### فرمانی رابوردووی(١) تێپەڕ

راناوە کەسی‌یە جوێ‌یەکان دەبنە کارای هەمــوو دەمەکانی فرمانی رابوردووی تێپەڕی کارا دیاری سادەو ناسادە لە شێوازی ئیخبــــاری‌و ئینشائی‌دا ، وە دەکەوونە بەشی نیهادەوە :

**١ ـ فرمانی رابوردووی تێپەڕی کارا دیاری سادە :**

راناوە کەسی‌یە جوێ‌یەکان لە رستەدا دەبنە کارای هەموو دەمەکانی فرمانی رابوردووی تێپەڕی کارا دیاری ســـــادەی ئیخبـــاری‌و ئینشائی :

**ا ـ وێنــە بۆ شێوازی ئیخباری :**

من شـــــێلام(١)   **( من )**

ئێمە شێلاومانە(٢)   **( ئێمە )**

تۆ شێلابووت(٣)   **( تــۆ )**

ئێوە دەتان شێلا(٤)   **( ئێوە )**

---

(١) رابوردووی ڕەبەق .

(٢) رابوردووی تەواو .

(٣) رابوردووی دوور .

(٤) رابوردووی بەردەوام .

**ب ـ وێنه بۆ شێوازی ئینشائی :**

خۆزگه ئـەو هەویرەکـــەی بشێلایە(١) **( ئـەو )**

خۆزگه ئەوان هەویرەکـــەیان شێلابوایە(٢) **( ئەوان )**

رەنگه من هەویرەکـــەم شـــێلابێت(٣) **( مـن )**

**٢ ـ فرمـــانی رابوردووی تێپەڕی کارا دیاری ناســـادە ( داڕژاو )**

راناوە کەسی‌یە جـــۆیێەکان لە رستەدا دەبنە کارای هەمـــــوو دەمەکانی فرمـــــانی رابوردووی تێپەڕی کارا دیاری ناســـادە ( داڕژاو )ی ئیخباری‌و ئینشائی :

---

(١) رابوردووی ناتەواوی ئینشائی .

(٢) رابوردووی دووری ئینشائی .

(٣) رابوردووی لێکدراوی ئینشائی .

تێبینی : مامۆستا توفیق وەهبی لە دەستووری زمانی کوردی‌دا ، ئەم سێ جۆرەی کە ناومان هێنان دەست‌نیشان‌کردووە . بەڵام لیـژنەی زمان لە کۆڕی زانیاری کوردا ، لە کتێبی ( رێزمانی ئاخاوتنی کوردی‌دا ) لاپەڕە ( ١٦٨ ) چوار جۆر ئیخباری‌و چوارجۆر ئینشائی دیاری‌کردووە :

| جۆری ئیخباری | جۆری ئینشائی |
| --- | --- |
| **رۆیشت** | **رۆیشـــتبا** |
| **دەڕۆیشت** | **بڕۆیشتبایە ( بڕۆیشتایە )** |
| **رۆیشتووە** | **رۆیشتبێت** |
| **رۆیشتبوو** | **رۆیشتبوایە ( رۆیشتبووبایە )** |

ا ـ وێنە بۆ شێوازی ئیخباری :

من هەڵم فڕانـد ( من )

ئێمە هەڵمان فڕاندووە ( ئێمە )

تۆ هەڵت فڕاندبوو ( تـۆ )

ئێوە هەڵتـــان دەفڕاند ( ئێوە )

ب ـ وێنە بۆ شێوازی ئینشـــائی :

خۆزگە من هەڵم بفڕاندایە ( مـن )

بریا ئەو هەڵی فڕاندبوایە ( ئـەو )

ڕەنگە ئەوان هەڵیان فڕاندبێت ( ئەوان )

٣ ـ فرمانی ڕابوردووی تێپەڕی کارادیاری ناسادە ( لێکدراو ) :

ڕاناوە کەسی بە جوێیەکان لـــە ڕستەدا دەبنــــە کارای هەموو دەمەکانی فرمـــانی ڕابوردووی تێپەڕی کارا دیاری ناســـادە ( لێکدراو )ی ئیخباریو ئینشـائی :

ا ـ وێنە بۆ شێوازی ئیخباری :

مـن ڕزگارم کـــرد ( مـن )

ئێمە ڕزگارمان کردووە ( ئێمە )

تۆ ڕزگارت کردبوو ( تـــۆ )

ئێوە ڕزگارتان دەکـــرد ( ئێوە )

ب ـ وێنە بۆ شێوازی ئینشائی :

خۆزگە ئەو ڕزگاری بکردایە ( ئـەو )

خۆزگە ئەوان ڕزگاریان کردبوایە ( ئەوان )

ڕەنگە ئێمە ڕزگارمان کردبێت ( ئێمە )

## ( ٢ )

### فرمـانی رابوردووی تێنەپەڕی کارادیار

راناوە کەسی‌یە جوێ‌یەکان لـــە رستەدا دەبنــــە کارای هەموو دەمەکانی فرمانی رابوردووی تێنەپەڕی سادەو ناسادەی کارادیار لـــە شێوازی ئیخباری‌و ئینشائی‌داو دەکەوونە بەشی نیهادەوە .

**١ ـ فرمانی رابوردووی تێنەپەڕی کارا دیاری سادە(١) :**

راناوە کەسی‌یە جوێ‌یەکان لـــە رستەدا دەبنــــە کارای هەموو دەمەکانی فرمانی رابوردووی تێنەپەڕی سادەی کارا دیار لـــە شێوازی ئیخباری‌و ئینشائی‌داو دەکەوونە بەشی نهادەوە :

---

(١) فرمانی بەپێی ڕووخـــارەکەی دەکرێت بە سێ جۆرەوە :

**١ ـ فرمانی سادە :** ئەو فرمانەیە کە لە تاکە مۆرفێمێك پێـــك هاتووە ، وە ناشێت ووشەکە کەرت بکرێت ، جاروبار زیادەی ( ەوە )ی دەچێتەسەر ئەمە لە سادەیی ناخات ، وەك :

هات ـ هاتەوە .

گرت ـ گرتەوە .

**٢ ـ فرمانی ناسادە :**

**أ ـ داڕژاو :**

ئەو کارەیە لە فرمانێك‌و زیادی‌یەك پێك‌هاتووە ، زیادی‌یەکە دەشێت پێشگر بێت ، یان پاشگر ، هەرکامێکیان بێت ، مەرج ئەوەیە واتای کارەکە بگۆڕێت ، وەك :

فڕی ـ هەڵفڕی

بەزی ـ دابەزی ←

**ا ــ وینه بۆ شــــێوازی ئیخباری :**

من پەشـــــۆکام .           **( مــن )**

ئێمــــــە پەشۆکاوین .           **( ئێمە )**

تــۆ پەشۆکابوویت .           **( تــۆ )**

ئێوە دەپەشــۆکان .           **( ئێوە )**

**ب ــ وینه بۆ شێوازی ئینشـــائی :**

خۆزگە ئەو بپەشوکایە .           **( ئـەو )**

خۆزگە ئەوان پەشوکابوونایە .           **( ئەوان )**

رەنگە ئێمـــــە پاشوکابین .           **( ئێمە )**

---

**بری ــ هەڵبری**

**کرد ــ کردەوە**

**گرت ــ وەرگرت**

**دا ــ لێدا**

**ب ــ لێکدراو :** ئەو کارەیە لە فرمانێکی ســـادەو ووشەیێکی واتادار پێکهاتبێتو بە هەردووکیان واتایەکی تازە پێکبهێنن ، کە هیچ کامیان بە تەنیا بیانگرین ، ئەو واتایە نەبەخشن ، وەك :

**بریاردان :** بریارمدا .

سوێندخواردن : سوێندی خوارد .

**قەپاڵگرتن :** قەپاڵتگرت .

**سەربرین :** مەرەکەمان سەربری .

**کاوێژکردن :** مەرەکە کاوێژ دەکات .

**٢ ـ فرمانی رابوردووی تێنەپەڕی کارا دیاری ناسادە ( دارِژاو ) :**

راناوە کەسی یە جوێیەکان لە رستەدا دەبنە کارای هەموو دەمەکانی فرمانی رابوردووی تێنەپەڕی کارا دیاری دارِژاو لە شێوازی ئیخباری و ئینشائی و دەکەوونە بەشی نیهادەوە .

**ا ـ وێنە بۆ شێوازی ئیخباری :**

من هەڵ خلیسکام ( مـن )

ئێمە هەڵ خلیسکاوین . ( ئێمە )

تۆ هەڵ خلیسکابوویت . ( تـۆ )

ئێوە هەڵ دەخلیسکان . ( ئێوە )

**ب ـ وێنە بۆ شێوازی ئینشائی :**

خۆزگە ئەو هەڵ بخلیسکایە . ( ئـەو )

بریا ئەوان هەڵ خلیسکابوونایە . ( ئەوان )

رەنگە تۆ هەڵ خلیسکابیت . ( تـۆ )

**٣ ـ فرمانی رابوردووی تێنەپەڕی کارا دیاری ناسادە ( لێکدراو ) :**

راناوە کەسی یە جوێیەکان لە رستەدا دەبنە کارای هەموو دەمەکانی فرمانی رابوردووی تێنەپەڕی کارا دیاری لێکدراوی ئیخباری و ئینشائی و دەکەوونە بەشی نیهادەوە :

**ا ـ وێنە بۆ شێوازی ئیخباری :**

من پاڵ کەوتم . ( مـن )

ئێمە پاڵ کەوتووین . ( ئێمە )

تۆ پاڵکەوتبـــوویت .　　　( تـۆ )

ئێوە پاڵ دەکەوتن .　　　( ئێوە )

ب ـ وێنە بۆ شێوازی ئینشـــائی :

کاشکی من پاڵ بکەوتمایە .　　　( مـن )

خۆزگە ئەو پاڵ کەوتبوایە .　　　( ئـەو )

رەنگە ئەوان پاڵ کەوتبن .　　　( ئەوان )

## ( ٣ )

## فرمانی رانەبوردووی تێپەڕی کارادیار

راناوە کەسی‌یە جوێیەکان لـــە رستەدا دەبنـــە کارای هەموو دەمەکانی فرمانی رانەبوردووی تێپەڕی سادەو نسادەی کارا دیار لـــە شێوازی ئیخباری‌و ئینشائی‌داو دەکەوونە بەشی نیهادەوە .

**١ ـ فرمانی رانەبوردووی تێپەڕی کارا دیاری سادە :**

راناوە کەسی‌یە جوێیەکان لـــە رستەدا دەبنـــە کارای هەموو دەمەکانی فرمانی رانەبوردووی تێپەڕی کارا دیاری سادە لـــــە شێوازی ئیخباری‌و ئینشـائی‌داو دەکەوونە بەشی نیهادەوە :

**أ ـ وێنـــە بۆ شێوازی ئیخباری :**

من دەخـــوێنم .　　　( مـن )

ئێمـــە دەخوێنین .　　　( ئێمە )

تـۆ دەخوێنیـت .　　　( تـۆ )

ئێوە دەخـــوێنن .　　　( ئێوە )

ئـەو دەخـــوێنێت .　　　( ئـەو )

ئەوان دەخـــوێنن　　　( ئەوان )

**ب ـ وێنـــه بۆ شێوازی ئینشـــائی :**

| | |
|---|---|
| من بخـــوێنم . | **( مــن )** |
| ئێمـه بخـــوێنین . | **( ئێمه )** |
| تــۆ بخـــوێنێت . | **( تــۆ )** |
| ئێـوه بخـــوێنن . | **( ئێوه )** |
| ئـەو بخـوێنێـت . | **( ئـەو )** |
| ئـەوان بخـــوێنن . | **( ئەوان )** |

**٢ ـ فرمانی ڕانەبوردووی تێپەڕی کارادیاری ناسادە ( داڕژاو ) :**

ڕاناوە کەسیی‌یە جوێیەکان لـــە ڕستەدا دەبنـــە کارای هەموو دەمەکانی فرمـــانی ڕانەبوردووی تێپەڕی کارا دیاری ناســـادە ( داڕژاو ) لـــە شێوازی ئیخباری‌و ئینشائی‌داو دەکەوونە بەشی نیهـــادەوە :

**ا ـ وێنـــه بۆ شێوازی ئیخباری :**

| | |
|---|---|
| من هەوای پـــاك هەڵدەمژم . | **( مــن )** |
| ئێمە هەوای پـــاك هەڵدەمژین . | **( ئێمه )** |
| تــۆ هەوای پـــاك هەڵدەمژیت . | **( تــۆ )** |
| ئێوه هەوای پـــاك هەڵدەمژن . | **( ئێوه )** |
| ئەو هەوای پـــاك هەڵدەمژێت . | **( ئـەو )** |
| ئەوان هەوای پـــاك هەڵدەمژن . | **( ئەوان )** |

**ب ـ وێنـه بۆ شێوازی ئینشـائی :**

من هەوای پـاك هەڵبمژم . ( مـن )

ئێمه هەوای پـاك هەڵبمژین . ( ئێمه )

تۆ هەوای پـاك هەڵبمژیت . ( تـۆ )

ئێوه هەوای پـاك هەڵبمژن . ( ئێوه )

ئەو هەوای پـاك هەڵبمژێت . ( ئـەو )

ئەوان هەوای پـاك هەڵبمژن . ( ئەوان )

**٣ ـ فرمانی رانەبوردووی تێپەڕی کارادیاری ناسادە ( لێکدراو ) :**

راناوە کەسی‌یە جۆێیەکان لە رستەدا دەبنە کارای دەمەکانی فرمانی رانەبوردووی تێپەڕی کارادیاری ناسادە ( لێکدراو ) لـــە شێوازی ئیخباری‌و ئینشـائی‌داو دەکەونە بەشی نیهادەوە :

**أ ـ وێنـه بۆ شێوازی ئیخباری :**

من چیفەکـــه لوولدەدەم . ( مـن )

ئێمه چیفەکـــه لوولدەدەین . ( ئێمه )

تۆ چیفەکـــه لوولدەدەکەیت . ( تـۆ )

ئێوه چیفەکـــه لوولدەدەن . ( ئێوه )

ئەو چیفەکـــه لوولدەدات . ( ئـەو )

ئەوان چیفەکـــه لوولدەدەن . ( ئەوان )

**ب ـ وێنـه بۆ شێوازی ئینشـائی :**

ڕەنگه من باڵندەکه بەرەڵلا بکەم . ( مـن )

ڕەنگه ئێمه باڵندەکه بەرەڵلا بکەین . ( ئێمه )

ڕەنگە تۆ باڵندەکە بەرەڵڵا بکەیت . ( تـۆ )

ڕەنگە ئێوە باڵندەکە بەرەڵڵا بکەن . ( ئێوە )

ڕەنگە ئەو باڵندەکە بەرەڵڵا بکات . ( ئـەو )

ڕەنگە ئەوان باڵندەکە بەرەڵڵا بکەن . ( ئەوان )

**( ٤ )**

## فرمـــانی ڕانەبوردووی تێنەپـــەڕی کارادیار

ڕاناوە کەسی‌یە جوێ‌یەکان لە ڕستەدا دەبنە کارای دەمەکانی فرمانی ڕانەبوردووی تێنەپەڕی سادەو ناسادەی کارا دیار لە شێوازی ئیخباری‌و ئینشائی‌داو دەکەوونە بەشی نیهادەوە :

**١ ــ وێنە بۆ فرمانی ڕانەبوردووی تێنەپەڕی سادەی کارا دیار :**

**أ ــ شێوازی ئیخبـاری :**

من دەچـــم بۆ ئەوێ . ( مـن )

ئێمە دەچـین بۆ ئەوێ . ( ئێمە )

تۆ دەچیـــت بۆ ئەوێ . ( تـۆ )

ئێوە دەچـن بۆ ئەوێ . ( ئێوە )

ئەو دەچێـــت بۆ ئەوێ . ( ئـەو )

ئەوان دەچـن بۆ ئەوێ . ( ئەوان )

**ب ــ شـێوازی ئینشـائی :**

من بڕۆم بۆ بازاڕ . ( مـن )

ئێمـە بڕۆین بۆ بازاڕ . ( ئێمە )

تـۆ برۆیت بـۆ بازاڕ . ( تـۆ )

ئێـوە بڕۆن بۆ بـازاڕ . ( ئێوە )

ئـەو بڕوات بـۆ بازاڕ . ( ئـەو )

ئەوان بڕۆن بـۆ بـازاڕ . ( ئەوان )

**٢ ـ وێنە بۆ فرمانی ڕانەبوردووی تێنەپەڕی ئاســـادە ( داڕێژراو )ی کارا دیـار :**

**أ ـ لە شێوازی ئیخباری‌دا :**

من بە چیاکەدا هەڵدەگـەڕێم . ( مـن )

ئێمە بە چیاکەدا هەڵدەگەڕێین . ( ئێمە )

تۆ بە چیاکەدا هەڵدەگەڕێیت . ( تـۆ )

ئێو بە چیاکەدا هەڵدەگەڕێن . ( ئێوە )

ئەو بە چیاکەدا هەڵدەگەڕێت . ( ئـەو )

ئەوان بە چیاکەدا هەڵدەگەڕێن . ( ئەوان )

**ب ـ لە شێوازی ئینشائی‌دا :**

من بە چیاکەدا هەڵبگەڕێم . ( مـن )

ئێمە بە چیاکەدا هەڵبگەڕێین . ( ئێمە )

تۆ بە چیاکەدا هەڵبگەڕێیت . ( تـۆ )

ئێوە بە چیاکەدا هەڵبگەڕێن . ( ئێوە )

ئەو بە چیاکەدا هەڵبگەڕێت . ( ئـەو )

ئەوان بە چیاکەدا هەڵبگەڕێن ( ئەوان )

٣ ـ وێنە بۆ فرمانی ڕانەبوردووی تێنەپەڕی ئاسـادە ( لێکدراو )ی کارا دیـار :

أ ـ لە شێوازی ئیخباریدا :

| | |
|---|---|
| من دەرباز دەبم . | ( مـن ) |
| ئێمە دەرباز دەبین . | ( ئێمە ) |
| تۆ دەرباز دەبیـت . | ( تـۆ ) |
| ئێـوە دەرباز دەبن . | ( ئێوە ) |
| ئـەو دەرباز دەبێـت . | ( ئـەو ) |
| ئەوان دەربـاز دەبن . | ( ئەوان ) |

ب ـ لە شێوازی ئینشائیدا :

| | |
|---|---|
| من دەربـاز ببم . | ( مـن ) |
| ئێمـە دەربـاز ببین . | ( ئێمە ) |
| تۆ دەربـاز ببیـت . | ( تـۆ ) |
| ئێوە دەربـاز ببن . | ( ئێوە ) |
| ئەو دەربـاز ببێـت . | ( ئـەو ) |
| ئەوان دەربـاز ببن . | ( ئەوان ) |

# ٥ ـ ئەرك و شوێنی جێگری کارا[1]

## (١)

### فرمانی رابوردووی کاراناديار

راناوە کەسیيە جوێيەکان لە رستەدا دەبنە جێگری کارای هەموو دەمەکانی فرمانی رابوردووی کارا نادیاری سادەو ناسادە لە شێوازی ئیخباری‌و ئینشائی‌داو دەکەوونە بەشی نیهادەوە ، وەك :

**١ ـ فرمانی رابوردووی سادەی کارا نادیار :**

راناوە کەسیيە جوێيەکان لە رستەدا دەبنە جێگری کارای هەموو دەمەکانی فرمانی رابوردووی کاراناديارى سادە لە شێوازی ئیخباری‌و ئینشائی‌داو ، دەکەوونە بەشی نیهادەوە ، وەك :

**ا ـ وێنە بۆ شێوازی ئیخباری :**

من شلەژێنرام . ( مـن )

ئێمە شلەژێنراوین . ( ئێمە )

تۆ شلەژێنرابوویت . ( تـۆ )

ئێوە دەشلەژێنران . ( ئێوە )

**ب ـ وێنە بۆ شێوازی ئینشائی :**

خۆزگە ئەو بشلەژێنرایە . ( ئـەو )

کاشکی ئەوان شلەژێنرابوونایە . (ئەوان)

رەنگە ئـەو شلەژێنرابێت . ( ئـەو )

---

(١) نائب الفاعل .

**٢ ــ فرمانی رابوردووی ناساده ( دارِژاو )ی کارا نادیار :**

راناوه کەسی‌یه جوێ‌یەکان له رستەدا دەبنه جێگری کارای هەموو دەمەکانی فرمانی رابوردووی کاراناریاری دارِژاو لـــــه شێوازی ئیخباری‌و ئینشائی‌داو دەکەوونه بەشی نیهادەوه .

**ا ــ وێنـــه بۆ شێوازی ئیخباری :**

| | |
|---|---|
| من هەڵ خەڵەتێنرام . | ( مــن ) |
| ئێمه هەڵ خەڵەتێنراوین . | ( ئێمه ) |
| تۆ هەڵ خەڵەتێنرابوویت . | ( تــۆ ) |
| ئێوه هەڵ دەخەڵەتێنران . | ( ئێوه ) |

**ب ــ وێنـــه بۆ شێوازی ئینشـــائی :**

| | |
|---|---|
| خۆزگه ئەو هەڵ بخەڵەتێنرایه . | ( ئــەو ) |
| بریا ئەوان هەڵ خەڵەتێنرابوونایه . | ( ئەوان ) |
| رەنگه تــۆ هەڵ خەڵەتێنرابێت . | ( تــۆ ) |

**٣ ــ فرمانی رابوردووی ناساده ( لێکدراو )ی کاراناریار :**

راناوه کەسی‌یه جوێ‌یەکان لـــــه رستەدا دەبنه جێگـــــری کارای هەموو دەمەکانی فرمانی رابوردووی ناساده ( لێکدراو )ی کارا نادیار له شێوازی ئیخباری‌و ئینشائی‌داو دەکەوونه بەشی نیهادەوه :

**ا ــ وێنـــه بۆ شێوازی ئیخباری :**

| | |
|---|---|
| من تەفـــره درام . | ( مــن ) |
| ئێمـــه تەفره دراوین . | ( ئێمه ) |
| تــۆ تەفره درابوویت . | ( تــۆ ) |
| ئێوه تەفــره دەدران . | ( ئێوه ) |

**ب ـ وێنـــه بۆ شێوازی ئینشـــائی :**

بریـــا من تەفـــرە بدرامایە .   ( مـــن )

کاشکی ئەو تەفرە درابوایە .   ( ئـــەو )

رەنگە ئەوان تەفرە درابن .   ( ئەوان )

**( ۲ )**

**فرمانی رانەبوردووی کاراناديار**

راناوە کەسی‌یە جوێ‌یەکان لـــــە رستەدا دەبنـــــە کارای فرمانی رانەبوردووی سادەو ناسادەی کارا نادیار لـــــە شێوازی ئیخبـــــاری‌و ئینشائی‌داو دەکەوونە بەشی نیهادەوە :

**۱ ـ وێنە بۆ فرمانی رانەبوردووی سادەی کاراناديار :**

**أ ـ لە شێوازی ئیخباری‌دا :**

مـــن دەناسرێم .   ( مـــن )

ئێمـــــە دەناسرێین .   ( ئێمە )

تـــۆ دەناسرێیـــــت .   ( تـــۆ )

ئێوە دەناسرێن .   ( ئێوە )

ئـــەو دەناسرێـــت .   ( ئـــەو )

ئـــەوان دەناسرێن .   ( ئەوان )

**ب ـ لـــە شێوازی ئینشائی‌دا :**

من بناسرێم .   ( مـــن )

ئێمە بناسرێین .   ( ئێمە )

تـــۆ بناسرێیـــــت .   ( تـــۆ )

ئێــــوه بناسرێن .　　　　( ئێوه )

ئــەو بناسرێت .　　　　( ئــەو )

ئەوان بناسرێن .　　　　( ئەوان )

**٢ ـ وێنه بۆ فرمانی ڕانەبوردووی ناساده ( داڕژاو )ی کارا نادیار :**

**ا ـ لــه شێوازی ئیخباریدا :**

من هەڵ دەســـــەنگێنرێم .　　　　( مــن )

ئێمـــــه هەڵ دەســـــەنگێنرێین .　　　　( ئێمه )

تــۆ هەڵ دەســـــەنگێنرێیت .　　　　( تــۆ )

ئێوه هەڵ دەســـــەنگێنرێن .　　　　( ئێوه )

ئــەو هەڵ دەســـــەنگێنرێت　　　　( ئــەو )

ئەوان هەڵ دەســـــەنگێنرێن .　　　　( ئەوان )

**ب ـ لــه شێوازی ئینشائیدا :**

مــن هەڵ بســـــەنگێنرێم .　　　　( مــن )

ئێمــه هەڵ بســـــەنگێنرێین .　　　　( ئێمه )

تــۆ هەڵ بســـــەنگێنرێیت .　　　　( تــۆ )

ئێوه هەڵ بســـــەنگێنرێن .　　　　( ئێوه )

ئەو هەڵ بســـــەنگێنرێت .　　　　( ئــەو )

ئەوان هەڵ بســـــەنگێنرێن .　　　　( ئەوان )

**٣ ـ وێنه بۆ فرمانی ڕانەبوردووی ناساده ( لێکدراو )ی کارا نادیار ؟**

**ا ـ لــه شێوازی ئیخباریدا :**

من گەمارۆ دەدرێم .　　　　( مــن )

ئێمه گەمارۆ دەدرێین .　　　　( ئێمه )

تۆ گەمارۆ دەدرێیت . ( تـۆ )

ئێوە گەمارۆ دەدرێن . ( ئێوە )

ئەو گەمارۆ دەدرێت . ( ئـەو )

ئەوان گەمارۆ دەدرێن . ( ئەوان )

**ب ـ لـە شێوازی نیشانیدا :**

مـن ســوێند بدرێم . ( مـن )

ئێمە ســوێند بدرێین . ( ئێمە )

تـۆ ســوێند بدرێیت . ( تـۆ )

ئێوە ســوێند بدرێن . ( ئێوە )

ئەو ســوێند بدرێت . ( ئـەو )

ئەوان ســوێند بدرێن . ( ئەوان )

## ( ٣ )

### فرمانی ئەمری تێپەڕ

راناوە کەسی‌یە جۆیەکانی کەسی دووەمی تاکو کۆ دەبنە کارای فرمانی ئەمری تێپەڕی سادەو ناسادە لـە شێوەی ئەریو نەریدا ، وەك :

**١ ـ وێنە بۆ فرمانی ئەمری تێپەڕی ســادە :**

**أ ـ لـە شێوەی ئەریدا :**

تـۆ باخەوانەکـە بدوێنە . ( تـۆ )

ئێوە باخەوانەکـە بدوێنن . ( ئێوە )

ب ـ لــه شێوەی نەرێدا :

تۆ باخەوانەکــە مەدوێنە . ( تــۆ )

ئێوە باخەوانەکــە مەدوێنن . ( ئێوە )

٢ ـ وێنە بۆ فرمانی ئەمری تێپەڕی ناسادە ( دارێژاو ) :

ا ـ لـە شـێوەی ئەرێدا :

تــۆ جلەکان هەڵبخــە . ( تــۆ )

ئێوە جلەکان هەڵبخــەن . ( ئێوە )

ب ـ لــە شێوەی نەرێدا :

تۆ جلەکان هەڵمەخــە . ( تــۆ )

ئێوە جلەکان هەڵمەخــەن . ( ئێوە )

٣ ـ وێنە بۆ فرمانی ئەمری تێپەڕی ناسادە ( لێکدراو ) :

ا ـ لـە شـێوەی ئەرێدا :

تــۆ پەردەکــە بڕکبدە . ( تــۆ )

ئێــوە پەردەکــە بڕکبدەن . ( ئێوە )

ب ـ لــە شێوەی نەرێدا :

تۆ پەردەکــە بڕکمەدە . ( تــۆ )

ئێــوە پەردەکـە بڕکمەدەن . ( ئێوە )

( ٤ )

## فرمانی ئەمری تێنەپەڕ

راناوە کەسی‌یە جوێیەکانی کەسی دووەمی تاکو کۆ لــە رستەدا دەبنــە کارای فرمانی ئەمری تێنەپەڕی سادەو ناسادە لــە شێوەی ئەرێو نەرێدا :

١ ـ وێنە بۆ فرمانی تێنەپەڕی سادە :

ا ـ لە شێوەی ئەرێدا :

تۆ بفڕە . ( تۆ )

ئێوە بفڕن . ( ئێوە )

ب ـ لە شێوەی نەرێدا :

تۆ مەفڕە . ( تۆ )

ئێوە مەفڕن . ( ئێوە )

٢ ـ وێنە بۆ فرمانی ئەمری تێنەپەڕی ناسادە ( داڕژاو ) :

ا ـ لە شێوەی ئەرێدا :

تۆ ڕاپەڕە . ( تۆ )

ئێوە ڕاپەڕن . ( ئێوە )

ب ـ لە شێوەی نەرێدا :

تۆ ڕامەپەڕە . ( تۆ )

ئێوە ڕامەپەڕن . ( ئێوە )

٣ ـ وێنە بۆ فرمانی ئەمری تێنەپەڕی ناسادە ( لێکدراو ) :

ا ـ لە شێوەی ئەرێدا :

تۆ پێش بکەوە . ( تۆ )

ئێوە پێش بکەون . ( ئێوە )

ب ـ لە شێوەی نەرێدا :

تۆ دوامەکەوە . ( تۆ )

ئێوە دوامەکەون . ( ئێوە )

## ٣ـ ئەرکی بەرکاری راستەوخۆ

### ( ١ )

### فرمانی رابوردووی تێپەڕی کاردیار

راناوە کەسی‌یە جوێ‌یەکان لە رستەدا دەبنە بەرکاری راستەوخۆی هەموو دەمەکانی فرمانی رابوردووی تێپەڕی کاردیاری سـادەو ناسادە لە شێوازی ئیخباری‌و ئینشائی‌دا و هەمیشە دەکەونە بەشی گوزارەوە :

**١ ـ فرمانی رابوردووی تێپەڕی سادە :**

راناوە کەسی‌یە جوێ‌یەکان لە رستەدا دەبنە بەرکاری راستەوخۆی هەموو دەمەکانی فرمانی رابوردووی تێپەڕی سادە لە شێوازی ئیخباری‌و ئینشائی‌داو هەمیشە دەکەونە بەشی گوزارەی رستەوە .

**أ ـ وێنە بۆ شێوازی ئیخباری :**

ئاوات منی گرت . **( مـن )**

ئاوات ئێمەی گرتووە . **( ئێمە )**

ئاوات تۆی گرتبـــوو . **( تـۆ )**

ئاوات ئێـوەی دەگرت . **( ئێـوە )**

**ب ـ وێنە بۆ شێوازی ئینشائی :**

خۆزگە ئاوات ئەوی بگرتایە . **( ئەو )**

بریا ئاوات ئەوانی گرتبوایە . **( ئەوان )**

رەنگە ئاوات ئێمەی گرتبێت . **( ئێمە )**

٢ ـ فرمانی رابوردووی تێپەڕی کارادیاری ناسادە ( داڕژاو ) :

راناوە کەسی‌یە جوێ‌یەکان لە رستەدا دەبنە بەرکاری راستەوخۆی هەموو دەمەکانی فرمانی رابوردووی تێپەڕی کارادیاری ناسادە ( داڕژاو ) لە شێوازی ئیخباری‌و ئینشائی‌داو ، هەمیشە دەکەوونە بەشی گوزارەی رستەوە ، وەك :

أ ـ وێنە بۆ شێوازی ئیخباری :

پاسەوانەکە منی راڕفاند . ( مـن )

پاسەوانەکە ئێمەی راڕفاندووە . ( ئێمە )

پاسەوانەکە تۆی راڕفاندبوو . ( تـۆ )

پاسەوانەکە ئێوەی رادەرِفاند . ( ئێوە )

ب ـ وێنە بۆ شێوازی ئینشائی :

خۆزگە پاسەوانەکە ئەوی ڕابڕفاندایە . ( ئـەو )

بریا پاسەوانەکە ئەوانی راڕفاندبوایە . ( ئەوان )

رەنگە پاسەوانەکە تۆی راڕفاندبێت . ( تـۆ )

٣ ـ فرمانی رابوردووی تێپەڕی کارادیاری ناسادە ( لێکدراو ) :

راناوە کەسی‌یە جوێ‌یەکان لە رستەدا دەبنە بەرکاری راستەوخۆی هەموو دەمەکانی فرمانی رابوردووی تێپەڕی کارادیاری ناسادە ( لێکدراو ) لە شێوازی ئیخباری‌و ئینشائی‌داو هەمیشە دەکەوونە بەشی گوزارەوە :

أ ـ وێنە بۆ شێوازی ئیخباری :

پیرێتی‌یەکە منی پەك‌خست . ( مـن )

پیرێتی‌یەکە ئێمەی پەك‌خستووە . ( ئێمە )

پیرێتی‌یەکە تۆی پەکخستبوو .      ( تــۆ )

پیرێتی‌یەکە ئێوەی پەکدەخست .      ( ئێوە )

**ب ـ وێنە بۆ شێوازی ئینشائی :**

بریـا پیرێتی‌یەکە تۆی پەکبخستایە .      ( تــۆ )

کاشکی پیرێتی‌یەکە ئەوی پەکخستبوایە .  ( ئــەو )

رەنگە پیرێتی‌یەکە ئەوانی پەکخـــستبێت .  ( ئەوان )

**( ٢ )**

**فرمانی رانەبوردووی تێپەڕی کارادیار**

راناوە کەسی‌یە جۆی‌یەکان لە رستەدا دەبنە بەرکاری راستەوخۆی فرمانی رانەبوردووی تێپەڕی سادەو ناسادەی کارادیار لـــە شێوازی ئیختیاریو ئینشائی‌دا و هەمیشە دەکەونە بەشی گوزارەوە ، وەك :

**١ ـ فرمانی رانەبوردووی تێپەڕی سادە :**

راناوە کەسی‌یە جۆی‌یەکان لە رستەدا دەبنە بەرکاری راستەوخۆی فرمانی رانەبوردووی تێپەڕی کارادیاری سادە لە شێوازی ئیخبـــاریو ئینشـــائی‌دا :

**ا ـ وێنە بۆ شێوازی ئیخباری :**

من تۆ دەبینم .      ( تــۆ )

ئێمە ئێوە دەبینین .  ( ئێوە )

تۆ من دەبینیت .    ( مــن )

ئێوە ئێمە دەبینن .  ( ئێمە )

من ئەو دەبینم .    ( ئــەو )

ئێوە ئەوان دەبینن .  ( ئەوان )

ب ـ وێنه بۆ شێوازی ئینشائی :

ڕەنگە من تۆ ببینم . ( تـۆ )

ڕەنگە ئێمە ئێوە ببینن . ( ئێوە )

ڕەنگە تۆ من ببینیت . ( مـن )

ڕەنگە ئێوە ئێمەببینن . ( ئێمە )

ڕەنگە من ئەو ببینم . ( ئـەو )

ڕەنگە ئێوە ئەوان ببینن . ( ئەوان )

٢ ـ فرمانی ڕانەبوردووی تێپەڕی کارادیاری سادە ( داڕژاو ) :

ڕاناوە کەسیی‌یە جوێ‌یەکان لە ڕستەدا دەبنە بەرکاری ڕاستەوخۆی فرمانی ڕانەبوردووی تێپەڕی کارا دیاری سادە ( داڕژاو ) لە شێوازی ئیخباری‌و ئینشائی‌دا :

ا ـ وێنه بۆ شێوازی ئیخباری :

من تۆ ڕادەسپێرم . ( تـۆ )

ئێمە ئێوە ڕادەسپێرین . ( ئێوە )

تۆ من ڕادەسپێریت . ( مـن )

ئێوە ئێمە ڕادەسپێرن . ( ئێمە )

من ئەو ڕادەسپێرم . ( ئـەو )

ئێوە ئەوان ڕادەسپێرن . ( ئەوان )

ب ـ وێنه بۆ شێوازی ئینشائی :

ڕەنگە من تۆ ڕابسپێرم . ( تـۆ )

ڕەنگە ئێمە ئێوە ڕابسپێرین . ( ئێوە )

| | |
|---|---|
| ڕەنگە تۆ من ڕابسپێریت . | ( مـن ) |
| ڕەنگە ئێوە ئێمە ڕابسپێرن . | ( ئێمە ) |
| ڕەنگە من ئەو ڕابسپێرم . | ( ئـەو ) |
| ڕەنگە ئێوە ئەوان ڕابسپێرن . | ( ئەوان ) |

**٢ ـ فرمانی ڕانەبوردووی تێپەڕی کارادیاری ناسادە ( لێکدراو ) :**

ڕاناوە کەسی‌یە جۆی‌یەکان لە ڕستەدا دەبنە بەرکاری ڕاستەوخۆی فرمانی ڕانەبوردووی تێپەڕی کارادیاری ناسادە ( لێکدراو ) لە شێوازی ئیخباری‌و ئینشائی‌دا ، وەك :

**ا ـ وێنە بۆ شێوازی ئیخباری :**

| | |
|---|---|
| من تـۆ گرەدەدەم . | ( تـۆ ) |
| ئێمە ئێوە گردەدەین . | ( ئێوە ) |
| تۆ من گردەدەیت . | ( مـن ) |
| ئێوە ئێمە گردەدەن . | ( ئێمە ) |
| من ئەو گردەدەم . | ( ئـەو ) |
| ئێوە ئەوان گردەدەن . | ( ئەوان ) |

**ب ـ وێنە بۆ شێوازی ئینشائی :**

| | |
|---|---|
| ڕەنگە من تۆ گربدەم . | ( تـۆ ) |
| ڕەنگە ئێمە ئێوە گربدەین . | ( ئێوە ) |
| ڕەنگە تۆ من گربدەیت . | ( مـن ) |
| ڕەنگە ئێوە ئێمە گربدەن . | ( ئێمە ) |
| ڕەنگە من ئەو گربدەم . | ( ئـەو ) |
| ڕەنگە ئێوە ئەوان گربدەن . | ( ئەوان ) |

## (٣)

### « فرمانی ئەمری تێپەڕ »

راناوە کەسی یە جوێیەکان لە رستەدا دەبنە بەرکاری راستەوخۆی فرمانی ئەمری تێپەڕی سادەو ناسادە لە شێوازی ئەرێو نەرێداو هەمیشە دەکەوونە بەشی گوزارەوە :ـ

**ا ـ وێنە بۆ فرمانی ئەمری تێپەڕی سادە :**

تۆ ئێمە لەگەڵ خۆت بەرە . **( ئێمە )**

ئێوە من لەگەڵ خۆتان بەرن . **( مـن )**

**ب ـ وێنە بۆ فرمانی ئەمری تێپەڕی ناسادە ( داڕژاو ) :**

تۆ ئەو رابـسـپێرە . **( ئـەو )**

ئێوە ئێمە هەڵمەکێشن . **( ئێمە )**

**ج ـ وێنە بۆ فرمانی ئەمری تێپەڕی ناسادە ( لێکدراو ) :**

تۆ ئێمە تووڕەمەکە . **( ئێمە )**

ئێوە ئەوان دەربازبکەن . **( ئەوان )**

# ٤ ـ ئەرکی بەرکاری ناراستەوخۆ

## ( ١ )

### فرمانی رابوردووی تێپەڕی کارادیار

راناوە کەسی‌یە جوێ‌بەکان لـــە رســـتەدا بە یاریدەی ئامرازی پەیوەندی‌یەوە دەبنە بەرکاری ناراستەوخـۆی هەموو دەمەکانی فرمانی رابوردووی تێپەڕی سادەو ناسادەی کارادیار لە شێوەی ئیخبـــاری‌و ئینشـــائی‌دا .

**١ ـ وێنە بۆ فرمانی رابوردووی تێپەڕی کارادیاری سادە :**

**ا ـ لە شێوەی ئیخباری‌دا :**

کاکم نەمامەکەی بۆ من ناشت . **( مـن )**

کاکم نەمامەکەی بۆ ئێمە ناشتووە . **( ئێمە )**

کاکم نەمامەکەی بۆ تۆ ناشتبوو . **( تـۆ )**

کاکم نەمامەکەی بۆ ئێوە دەناشت . **( ئێوە )**

**ب ـ لە شێوەی ئینشائی‌دا :**

خۆزگە کاکم نەمامەکەی بۆ ئەو بناشتایە . **( ئـەو )**

بریا کاکم نەمامەکەی بۆ ئەوان ناشتبوایە . **( ئەوان )**

رەنگە کاکم نەمامەکەی بۆ ئێوە ناشتبێت . **( ئێوە )**

**٢ ـ وێنە بۆ فرمانی رابوردووی تێپەڕی کارادیاری ناسادە ( داڕژاو ) :**

**ا ـ لـە شێوازی ئیخباری‌دا :**

ئاسۆس دەرگاکەی لەسەر من داخست . **( مـن )**

ئاسۆس دەرگاکەی لەسەر ئێمە داختسووە . **( ئێمە )**

ئاسۆس دەرگاکەی لەسەر تۆ داخستبوو . **( تـۆ )**

ئاسۆس دەرگاکەی لەسەر ئێوە دادەخست . **( ئێوە )**

**ب ـ لە شێوازی ئینشائی‌دا :**

خۆزگە ئاسۆس دەرگاکەی لەسەر من دابخستایە . **( مـن )**

بریا ئاسۆس دەرگاکەی لەسەر ئەو داخستبوایە . **( ئـەو )**

رەنگە ئاسۆس دەرگاکەی لەسەر ئەوان داخستبێت . **( ئەوان )**

**٣ ـ وێنە بۆ فرمانی رابوردووی تێپەڕی کارادیاری ناسادە ( لێکدراو ) :**

**ا ـ لە شێوازی ئیخباری‌دا :**

| | | |
|---|---|---|
| سەپانەکە خەرمانەکەی بۆ | **من** | شەن‌کرد . |
| | **ئێمە** | شەن کردووە . |
| | **تـۆ** | شەن کردبوو . |
| | **ئێوە** | شەن دەکرد . |

**ب ـ لە شێوازی ئینشائی‌دا :**

خۆزگە سەپانەکە خەرمانەکەی بۆ من شەن‌بکردایە . **( مـن )**

بریا سەپانەکە خەرمانەکەی بۆ ئەو شەن‌کردبوایە . **( ئـەو )**

رەنگە سەپانەکە خەرمانەکەی بۆ ئەوان شەن‌کردبێت . **( ئەوان )**

## ( ٢ )

### فرمـــانی رابوردووی تێنەپەڕی کارادیار

ڕاناوە کەسی‌یە جوێ‌یەکان لــــــە ڕستەدا بە یاریدەی ئامرازی پەیوەندی‌یەوە دەبنە بەرکاری ناراســـــتەوخۆی هەموو دەمەکانی فرمانی رابوردووی تێنەپەڕی سادەو ناسادەی کارادیار لە شێوازی ئیخبـــاری‌و ئینشائی‌داو هەمیشە دەکەونە بەشی گوزارەوە .

**١ ـ وێنە بۆ فرمانی رابوردووی تێنەپەڕی کارادیاری سادە :**

**أ ـ لە شێوازی ئیخباری‌دا :**

| | |
|---|---|
| من هاتمەکن تۆ . | ( تــۆ ) |
| ئێمە هاتووینەکن ئێوە . . | ( ئێوە ) |
| تۆ هاتبوویتـــەکن من . | ( مــن ) |
| ئێوە دەهاتنەکن ئێمــە . | ( ئێمە ) |

**ب ـ لە شێوازی ئینشائی‌دا :**

| | |
|---|---|
| خۆزگە من بهاتمایەتەکن ئەو . | ( ئــەو ) |
| بریا ئێمە هاتبووینایەتەکن ئەوان . | ( ئەوان ) |
| ڕەنگە تۆ هاتبێتـــەکن من . | ( مــن ) |

**٢ ـ وێنە بۆ فرمانی رابوردووی تێنەپەڕی کارادیاری ناسادە ( داڕێژار ) :**

**أ ـ لە شێوازی ئیخباری‌دا :**

| | |
|---|---|
| تۆ لەگەڵ من ڕاوەســـتابیت . | ( مــن ) |
| ئێوە لەگەڵ ئێمە ڕاوەستاوون . | ( ئێمە ) |

من لەگەڵ تۆ راوەستابووم .      ( تـۆ )

ئێمە لەگەڵ ئێوە رادەوستاین .   ( ئێـوە )

ب ـ لە شێوازی ئینشائی‌دا :

خۆزگە تۆ لەگەڵ ئەو رابوەســـتیتایە .      ( ئـەو )

کاشکی ئێوە لەگەڵ ئەوان راوەستابوونایە .   ( ئەوان )

رەنگە ئەو لەگەڵ ئێمـــە راوەستابێت .      ( ئێمە )

٣ ـ وێنە بۆ فرمانی رابوردووی تێنەپەڕی کارادیاری ناسادە (لێکدراو) :

ا ـ لە شێوازی ئیخباری‌دا :

| | | |
|---|---|---|
| فەرهاد لە | من | مۆڕ بوەوە . |
| | ئێمە | مۆڕ بووبوەوە . |
| | تـۆ | مۆڕ بووەتەوە . |
| | ئێوە | مۆڕ دەبوەوە . |

ب ـ لە شێوازی ئینشائی‌دا :

خۆزگە فەرهاد لە ئەو مۆڕ ببوایەتەوە .      ( ئـەو )

بریا فەرهاد لـە ئەوان مۆڕ ببووایەوە .      ( ئەوان )

رەنگە فەرهاد لـە تۆ مۆڕ ببێتەوە .      ( تـۆ )

## ( ٣ )

### فرمانی رابوردووی کارا نادیار

راناوە کەسی‌یە جوێ‌یەکان لـــە رســـتەدا بە یاریدەی ئامرازی پەیوەندی‌یەوە دەبنە بەرکاری ناراســـتەوخۆی هەموو دەمەکانی فرمانی رابوردووی کارا نادیاری ســـادەو ناسادە لە شێوازی ئیخبـــاری‌و ئینشائی‌داو هەمیشە دەکەوونە بەشی گوزارەوە ، وەك :

۱ ــ وێنە بۆ فرمانی رابوردووی کاراناديارى سادە :

ا ــ لە شێوازی ئیخباریدا :

| | | |
|---|---|---|
| ئەسپەکە بۆ | من | هێنــرا . |
| | ئێمە | هێنــراوە . |
| | تــۆ | هێنــرابوو . |
| | ئێوە | دەهێنـــــرا . |

ب ــ لە شێوازی ئینشائیدا :

خۆزگە ئەسپەکە بۆ ئەو بهێنرایە . ( ئــەو )

بریا ئەسپەکە بۆ ئەوان هێنرابوایە . ( ئەوان )

رەنگە ئەسپەکە بۆ ئێمە هێنرابێت . ( ئێمە )

۲ ــ وێنە بۆ فرمانی رابوردووی کارا نادیاری ناسادە ( داڕژاو ) :

ا ــ لە شێوازی ئیخباریدا :

| | | |
|---|---|---|
| چراکە بۆ | من | داگیرسێنرا . |
| | ئێمە | داگیرسێنراوە . |
| | تــۆ | داگیرسێنرابوو . |
| | ئێوە | دادەگیرسێنرا . |

ب ــ لە شێوازی ئینشائیدا :

خۆزگە چراکە بۆ ئەو دابگیرسێنرایە . ( ئــەو )

بریا چراکە بۆ ئەوان داگیرسێنرابوایە . ( ئەوان )

رەنگە چراکە بۆ من داگیرسێنرابێت . ( مـن )

**٣ ـ وێنە بۆ فرمانی رابوردووی کارانادیاری نسادە ( لێکدراو ) :**

**ا ـ لە شێوازی ئیخباریدا :**

| | | |
|---|---|---|
| پیاوەکە لەگەڵ | **من** | دەربازکرا . |
| | **ئێمە** | دەربازکراوە . |
| | **تـۆ** | دەربازکرابوو . |
| | **ئێوە** | دەربازدەکرا . |

**ب ـ لە شێوازی ئینشائیدا :**

خۆزگە پیاوەکە لەگەڵ ئەو دەربازبکرایە . **( ئـەو )**

بریا پیاوەکە لەگەڵ ئەوان دەربازکرابوایە . **( ئەوان )**

رەنگە پیاوەکە لەگەڵ تۆ دەربازکرابێت . **( تـۆ )**

**( ٣ )**

## فرمـــــانی رانەبوردووی تێپـــەڕی کارادیار

راناوە کەسی‌یە جوێیەکان لـــە رســـتەدا بە یاریدەی ئامرازی پەیوەندی‌یەوە دەبنە بەرکاری ناراستەوخۆی. فرمانی رانەبوردووی تێپەڕی کارا دیاری سادەو ناسادە لە شێوازی ئیخباری‌و ئینشائی‌دا ، وەك :

**١ ـ وێنە بۆ فرمانی رانەبوردووی تێپەڕی کاردیاری سادە :**

**ا ـ لە شێوازی ئیخباریدا :**

| | | |
|---|---|---|
| باخەوانەکـــە بەرهەمەکـــەی بە | **مـن** | |
| | **ئێمە** | |
| | **تـۆ** | |
| | **ئێوە** | |
| | **ئـەو** | |
| | **ئەوان** | دەفرۆسێت . |

**ب ـ لە شێوازی ئینشائیدا :**

ڕەنگە باخەوانەکە بەرهەمەکەی بە | **مــن** <br> **ئێمە** <br> **تــۆ** <br> **ئێوە** <br> **ئــەو** <br> **ئەوان** | بفرۆشێت .

**٢ ـ وێنـــــە بۆ فرمانی ڕانەبوردووی تێپەڕی کارادیاری ناســـادە ( داڕژاو ) :**

**ا ـ لە شێوازی ئیخباریدا :**

دارا پارەکـــــەی لـــــە | **تــۆ** <br> **ئێوە** <br> **مــن** <br> **ئێمە** <br> **ئــەو** <br> **ئەوان** | وەردەگرێت .

**ب ـ لە شێوازی ئینشائیدا :**

ڕەنگە دارا پارەکـــە لـــە | **مــن** <br> **ئێمە** <br> **تــۆ** <br> **ئێوە** <br> **ئــەو** <br> **ئەوان** | وەربگیرێت .

٣ ـ وێنـــــە بۆ فرمانی ڕانەبوردووی تێپەڕی کارادیاری ناســـادە ( لێکدراو ) :

ا ـ لە شێوازی ئیخباری‌دا :

| | | |
|---|---|---|
| سـیروان خــۆی لـــەبەر | مـن | |
| | ئێمە | |
| | تــۆ | |
| | ئێوە | |
| | ئـەو | |
| | ئەوان | دوادەخات . |

ب ـ لە شێوازی ئینشائی‌دا :

| | | |
|---|---|---|
| ڕەنگە سـیروان خــۆی لەبەر | مـن | |
| | ئێمە | |
| | تــۆ | |
| | ئێوە | |
| | ئـەو | |
| | ئەوان | دوابخات . |

( ٤ )

## فرمانی ڕانەبوردووی کارا نادیـار

ڕاناوە کەسی‌یە جوێ‌بەکان لـــــە ڕستەدا بە یاریدەی ئامرازی پەیوەندی‌یەوە ، دەبنە بەرکاری ناڕاســـتەوخۆی فرمانی ڕانەبوردووی کاراناديارى سادەو ناسادە لە شێوازی ئیخباری‌و ئینشائی‌داو هەمیشـــە

دەکەوونە بەشی گوزارەوە ، وەك :

**١ ـ وێنە بۆ فرمانی ڕانەبوردووی کارانادیاری سادە :**

**أ ـ لە شێوازی ئیخباریدا :**

داوەکە بۆ | **من**<br>**ئێمە**<br>**تۆ**<br>**ئێوە**<br>**ئەو**<br>**ئەوان** | دەنرێتەوە .

**ب ـ لە شێوازی ئینشائیدا :**

ڕەنگە داوەکە بۆ | **من**<br>**ئێمە**<br>**تۆ**<br>**ئێوە**<br>**ئەو**<br>**ئەوان** | بنرێتەوە .

**٢ ـ وێنە بۆ فرمانی ڕانەبوردووی کاراناديارى نەسادە ( داڕژاو ) :**

**أ ـ لە شێوازی ئیخباریدا :**

نامەکە بە | **من**<br>**ئێمە**<br>**تۆ**<br>**ئێوە**<br>**ئەو**<br>**ئەوان** | هەڵدەکێشرێت .

ب ـ له شێوازی ئینشائیدا :

ڕەنگە نامەکە بە | من
ئێمە
تۆ
ئێوە
ئەو
ئەوان | هەڵبکێشرێت .

٣ ـ وێنە بۆ فرمانی ڕانەبوردووی کاراناديارى ناسادە ( لێکدراو ) :

ا ـ له شێوازی ئیخباریدا :

دوژمـــــن بـــه | من
ئێمە
تۆ
ئێوە
ئەو
ئەوان | پەرێشان دەکرێت .

ب ـ لە شێوازی ئینشائیدا :

ڕەنگە دوژمـــن بـــه | من
ئێمە
تۆ
ئێوە
ئەو
ئەوان | پەریشان بکرێت .

( ٥ )

## فرمانی رانەبوردووی تێنەپەڕی کارادیار

راناوە کەسی‌یە جوێ‌بەکان لە رستەدا بە یاریدەی ئامرازی پەیوەندی‌یەوە دەبنە بەرکاری‌ناراستەوخۆی فرمانی رانەبوردووی تێنەپەڕی کارادیاری سادەو ناسادە لە شێوازی ئیخباری‌و ئینشائی‌داو هەمیشە دەکەوونە بەشی گوزارەوە ، وەك :

**١ ـ وێنە بۆ فرمانی رانەبوردووی تێنەپەڕی سادە :**

**ا ـ لە شێوازی ئیخباری‌دا :**

گەلاکە بەسەر | **من**<br>**ئێمە**<br>**تۆ**<br>**ئێوە**<br>**ئەو**<br>**ئەوان** | دا دەوەرێت .

**ب ـ لە شێوازی ئینشائی‌دا :**

رەنگە گەلاکە بەسەر | **من**<br>**ئێمە**<br>**تۆ**<br>**ئێوە**<br>**ئەو**<br>**ئەوان** | دا هەڵبوەرێت .

**٢ ـ وێنە بۆ فرمانی ڕانەبوردووی تێنەپەڕی کارادیاری ناسادە (داڕژاو) :**

**أ ـ لە شێوازی ئیخباریدا :**

هیوا لەگەڵ | **من**
**ئێمە**
**تۆ**
**ئێوە**
**ئەو**
**ئەوان** | دا بە شەخاکەدا هەڵدەگەڕێت .

**ب ـ لە شێوازی ئینشائیدا :**

ڕەنگە هیوا لەگەڵ | **من**
**ئێمە**
**تۆ**
**ئێوە**
**ئەو**
**ئەوان** | دا بە شاخەکەدا هەڵبگەڕێت .

**٣ ـ وێنە بۆ فرمانی ڕانەبوردووی تێنەپەڕی کارادیاری ناسادە (لێکدراو) :**

**أ ـ لە شێوازی ئیخباریدا :**

گورگەکان لە | **من**
**ئێمە**
**تۆ**
**ئێوە**
**ئەو**
**ئەوان** | دوور دەکەونەوە .

**ب ـ لە شێوازی نێنشانیدا :**

| | | |
|---|---|---|
| رەنگە گورگەکان لـــە | **مـــن** | |
| | **ئێمە** | |
| | **تـــۆ** | |
| | **ئێوە** | |
| | **ئـــەو** | |
| | **ئەوان** | دوور بکەونەوە . |

**( ٦ )**

## فرمـــانی ئەمری تێپـــەڕ

راناوە کەسییە جۆێەکان لە رستەدا دەبنە بەرکاری ناڕاستەوخۆی فرمانی ئەمری تێپەڕی سادەو ناسادە بە یاریدەی ئامرازی پەیوەندییەوەو هەمیشـە دەکەوونە بەشی گوزارەوە ، وەك :

**١ ـ وێنە بۆ فرمانی ئەمری تێپەڕی سادە :**

| | | |
|---|---|---|
| تـــۆ ئاوێنەکـــە بـــۆ | **مـــن** | |
| | **ئێمە** | |
| | **ئـــەو** | |
| | **ئەوان** | بهێنـــە . |

**٢ ـ وێنە بۆ فرمانی ئەمری تێپەڕی ناسادە ( داڕژاو ) :**

| | | |
|---|---|---|
| تـــۆ بانەکـــە لەگەڵ | **مـــن** | |
| | **ئێمە** | |
| | **ئـــەو** | |
| | **ئەوان** | هەڵ بوەشێنە . |

٣ ـ وێنه بۆ فرمانی ئەمری تێپەڕی ناساده ( لێکدراو ) :

تۆ کاڵەکەکە بۆ | من<br>ئێمە<br>ئەو<br>ئەوان | پاك بکە .

## ( ٧ )

### فرمانی ئەمری تێنەپەڕ

راناوە کەسی‌یە جوێیەکان لە رستەدا دەبنە بەرکاری ناراستەوخۆی فرمانی ئەمری تێنەپەڕی سادەو ناسادە بە یاریدەی ئامرازی پەیوەندی‌یەوەو هەمیشە دەکەوونە بەشی گوزارەوە ، وەك :

١ ـ وێنە بۆ فرمانی ئەمری تێنەپەڕی سادە :

تۆ لەبەر | من<br>ئێمە<br>ئەو<br>ئەوان | مەتۆرێ .

٢ ـ وێنە بۆ فرمانی ئەمری تێنەپەڕی ناسادە ( داڕژاو ) :

تۆ لەگەڵ | من<br>ئێمە<br>ئەو<br>ئەوان | دانیشە .

**٣ ـ وێنە بۆ فرمانی ئەمری تێنەپەڕی ئاسادە ( لێکدراو ) :**

| | | |
|---|---|---|
| تـۆ لـــــــە | **مـــن** | |
| | **ئێمە** | |
| | **ئـــەو** | |
| | **ئەوان** | دڵنیـا بە . |

## ٥ ـ ئەرکی تەواوکەر (١)

راناوە کەسی‌یە جوێ‌یەکان لە رستەدا بە یاریدەی ئامرازی پەیوەندی
( ی )ەوە ، ( ناو ) دیاری‌و تەواودەکەن ، وەك :

خانووەکە ـ ی ـ | من
ئێمە
تۆ
ئێوە
ئەو
ئەوان | لە بێرونی شارە .

لێرەدا ڕاناوە کەسی‌یە جوێ‌یەکانی ( من ـ ئێمە ، تۆ ـ ئێوە ؛ ئەو ـ ئەوان ) بە یاریدەی ئامرازی(ی) پەیوەندی‌یەوە ناوی ( خانووەکە )یان دیاری‌و تەواوکردووە ، بۆیە :

١ ـ بە ناوی ( خانووەکە ) دەگوترێت ( تەواوکراو ) .

٢ ـ بە راناوە کەسی‌یە جوێ‌یەکان دەگوترێت ( تەواوکەر ) .

٣ ـ ( تەواوکەر ) هەمیشە بەدوای ( تەواوکراو )دا دێت .

٤ ـ وە تەواوکراویش لە رستەدا دەشێت :

---

(١) المتمم ( المضاف الیـه ) .

**١ ـ ناوێکی ( سادە ) بێت ، وەك :**

— برای من ( برا ـ ی ـ من ) .
— سێوێکی ئەوان ( سێوێك ـ ی ـ ئەوان ) .
— کوڕانی ئێوە ( کوڕ ـ ان ـ ی ـ ئێوە ) .
— کوڕەکەی تۆ ( کوڕ ـ ەکە ـ ی ـ تۆ ) .
— بەرخەکانی ئێمە ( بەرخ ـ ەکان ـ ی ـ ئێمە ) .
— ئەم بەرخەی من ( ئەم ـ بەرخ ـ ە ـ ی ـ من ) .

**٢ ـ ناوێکی ( نائسادە ) بێت ، وەك :**

— گوڵەگەنمی ئەوان ( گوڵەگەنم ـ ی ـ ئەوان ) .
— کرێکارانی ئێمە ( کرێکاران ـ ی ـ ئێمە ) .
— چاوجوانەکەی ئێوە ( چاوجوانەکە ـ ی ـ ئێوە ) .
— دارتاشەکانی ئەوان ( دارتاشەکان ـ ی ـ ئەوان ) .
— ئەم کلکەبێلەی تۆ ( ئەم ـ کلکەبێل ـ ە ـ ی ـ تۆ ) .

**٣ ـ دەشبێت ( راناوێـك )(١) بێت ، وەك :**

**ا ـ راناوی ( نیشانە ) ، وەك :**

ئەمەی من بەرن بۆ خۆتان . ( ئەمە ـ ی ـ من ) .
ئەمانەی تۆ نادەم بە کەس . ( ئەمانە ـ ی ـ تۆ ) .
ئەوەی ئێوە بۆ خۆم دادەنێم . ( ئەوە ـ ی ـ ئێوە ) .
ئەوانەی ئێمە بفرۆشن . ( ئەوانە ـ ی ـ ئێمە ) .

---

(١) راناوی کەسی‌جوێ‌و راناوی‌لێکدەرو راناوی خۆیی بە راناوی جوێ تەواو ناکرێن .

**ب ـ راناوی ( نادیار ) ، وەك :**

کەسی تۆ بێرەدا نەرۆیبوە . ( کەس ـ ی ـ تۆ ) .

هیچی من مەدە بە کەس . ( هیچ ـ ی ـ من ) .

**ج ـ راناوی ( پرسیار ) ، وەك :**

کێی ئێوە چووە بۆ لادێ . ( کێ ـ ی ـ ئێوە ) .

کوێی تۆ بریندارە . ( کوێ ـ ی ـ تۆ ) .

بە چیی ئەوانەوە دەنازێت . ( بەچی ـ ی ـ لەوانەوە ) .

**د ـ راناوی ( مولکی ) ، وەك :**

هی‌ی من بەرە نەك هی‌ی ئەو . ( هی ـ ی ـ من ) .

هی‌ی ئێوەم ناوێت . ( هی ـ ی ـ ئێوە ) .

هی‌ی ئەوان بە سوودە . ( هی ـ ی ـ ئەوان ) .

راناوە کەسی‌یە جوێیەکان لە رستەدا ، دەبنە :

**١ ـ تەواوکەری کارا .**

**٢ ـ تەواوکەری جێگری کارا .**

**٣ ـ تەواوکەری بەرکاری راستەوخۆ .**

**٤ ـ تەواوکەری بەرکاری ناراستەوخۆ .**

ئەوا یەکەیەکە لێیان دەدوێین و شوێنەکانیان لە رستەدا دەستنیشان دەکەین .

( ١ )

# تەواوکەری کارا

راناوە کەسی‌یە جوێ‌بەکان لـــە رستەدا بە یاریدەی ئامرازی (ی) پەیوەندی‌یەوە :

١ ـ دەبنە تەواوکەری کارای **فرمانی رابوردووی تێپەڕی** کارادیـــاری ســـادەو ناسادەی **ئیخباری**و ئینشائی لە شێوازی ئەرێ‌و نەرێ‌داو **هەمیشـە بەدوای** کارادا دێن لە بەشی نیهاددا :

**ا ـ وێنە بۆ ســادە :**

جوتیارەکە ـ ی ـ | **مـن** | **ئێمە** | **تـۆ** | **ئێوە** | **ئـەو** | **ئەوان** | وردەکەی

کێلا ( نەکێلا )

کێلاوە (نەکێلاوە)

دەکێلا (نەدەکێلا)

کێلابوو (نەکێلابوو)

بکێلایە (نەکێلایە).

کێلابوایە (نەکێلابوایە)

کێلابێت (نەکێلابێت)

## (٣)

# فرمانی ئەمری تێپەڕ

راناوە کەسی یە لکاوەکانی کۆمەڵەی ٨ لە رستەدا لە جێی راناوە کەسی یە جوێ یەکان دەبنە بەرکاری راستەوخۆی فرمانی ئەمری تێپەڕی سادەو ناسادە لە شێوازی ئەرێ و نەرێدا :

**١ ـ لە شێوازی ئەرێدا :**

أ ـ ئەگەر فرمانەکە سادەبوو ، راناوەکانی کۆمەڵەی A کە دەبنە بەرکاری راستەوخۆی فرمانی ئەمری تێپەڕی سادە بەکەر دەلکێنرێن بەدوای رێژەی فرمانەکەوەو لەتەك ووشەکانی‌تردا وەها دەریزێن .

**ـــ رێژەی ب**

**ـــ راناوی بەرکاری راستەوخۆ لە A**

**ـــ رەگی فرمان**

**ـــ راناوی بکەر لە B ، وەك :**

بمخەوێنە . ( ب ـ م ـ خەوێن ـ ە )

بیان نەخشێنن . ( ب ـ یان ـ نەخشێن ـ ن )

ب ـ ئەگەر فرمانەکە ناسادە ( دارژاو ) یان ( لێکدراو ) بوو ، راناوەکانی کۆمەڵەی A کە دەبنە بەرکاری راستەوخۆی فرمانی ئەمری تێپەڕی ناسادە بەکەر دەلکێنرێن بە دوای پێشگرەکە ، یان بەشی یەکەمی فرمانە لێکدراوەکەوە و لەتەك ووشەکانی‌تری رستەکەدا وەها ددریزێن :

**ـــ پێشگر ( دارژاو ) | ناسادە**
**ـــ ب ١ ( لێکدراو ) |**

ـــ راناوی بەرکاری راستەوخۆ ك A

ـــ ڕیژەو ڕەگ

ـــ راناوی بکەر ك B ، وەك :

**وێنە بۆ ناسادەی داڕژاو :**

هەڵمان بسێنن . ( هەڵ ـ مان ـ ب ـ سێن ـ ن )

ڕایان بوەشێنە . ( ڕا ـ یان ـ ب ـ وەشێن ـ ە )

**وێنە بۆ ناسادەی لێکدراو :**

فریام بکەوە . ( فریا ـ م ـ ب ـ کە ـ ... وە )

پەکیان بخەن . ( یەك ـ یان ـ ب ـ خە ـ ن )

**٢ ـ لە شێوازی نەرێدا :**

١ ـ ئەگـــەر فرمانەکە ســـادەبوو ، راناوە کەسییە لکاوەکانی کۆمەڵـەی A کە لە رستەدا دەبنە بەرکاری راستەوخۆ دەلکێنرێن بەدوای ئامرازی نەهێداو لـەتەك ووشەکانیتردا وەها دەریزێن :

**ـــ ئامرازی نەفی لەجێی ریژەی ( ب )**

**ـــ راناوی بەرکاری راستەوخۆ ( ك A )**

**ـــ ڕەگی فرمان**

**ـــ راناوی بکەر ك B ، وەك :**

**بم هاوێن ـ مەم هاوێن ( مە ـ م ـ هاوێ ـ ن )**

**بیماڵە ـ مەیماڵە ( مە ـ ی ـ ماڵ ـ ە )**

ب ــ ئەگەر فرمانەکە ناســــــادەبوو ، راناوە کەسی‌یە لکاوەکانی کومەلەی A کە دەبنە بەرکاری راستەوخۆ دەلکێنرێن یــا بەدوای پێشگری فرمانی نــاسادەی دارژاوە وە ، یان بەشی یەکەمی فرمانە ناسادە لێکدراوەکەوەو ئامرازە نەهی‌یەکــــــە دەخرێتــــە پێش رەگی فرمانە ناســــادەکەوەو لـــەتەك وشەکانی‌تری رستەکەدا وەها دەریزێن :

**ــــ پێشگر ( ناسادەی دارژاو )**

**ــــ ب ۱ ( ناسادەی لێکدراو )**

**ــــ راناوی بەرکاری ناراستەوخۆ لە A**

**ــــ ئامرازی نەهی لەجێی ریژەی ( ب )**

**ــــ رەگی فرمان**

**ــــ راناوی بکەر لە B ، وەك :**

**وێنە بۆ ناسادەی دارژاو :**

هەلم مەستێنن . ( هەل ــ م ــ مە ــ ستێن ــ ن )

دای مەگرسێنە . ( دا ــ ی ــ مە ــ گرسێن ــ )

**وێنە بۆ ناسادەی لێکدراو :**

فێرم بکە . ( فێر ــ م ــ ب ــ کە ــ . . .

یادی‌ی(۱) بخەنەوە . ( یاد ــ ی ــ ب ــ خە ــ ن ــ دوە )

---

(۱) ( ی ) یەکەمیان هی بەشی یەکەمی فرمانەکەیە ( یادی ) ، وە ( ی ) دووەم راناوی بەرکاری راستەوخۆیە بۆ کەسی یەکەمی تاك .

(٢)

# ئەرکی بەرکاری ناراستەوخۆ

راناوە کەسی‌یە لکاوەکانی کۆمەڵەی A لە رستەدا بە یاریدەی یەکێ لە ئامرازەکانی پەیوەندی‌یەوە دەبنە بەرکاری ناراستەوخۆی :

١ ــ فرمانی رابوردووی تێپەڕی کارادیار .

٢ ــ فرمانی رابوردووی تێنەپەڕی کارادیار .

٣ ــ فرمانی رابوردووی کارانادیار

٤ ــ فرمانی ڕانەبووردووی تێپەڕی کارادیار .

٥ ــ فرمانی ڕانەبووردووی تێپەڕی کارادیار .

٦ ــ فرمانی ڕانەبووردووی کارانادیار

٧ ــ فرمانی ئەمری تێپەڕ .

٨ ــ فرمانی ئەمری تێنەپەڕ

(١)

# فرمانی رابوردووی تێپەڕی کارادیار

راناوە کەسی‌یە لکاوەکانی کۆمەڵەی A لە رستەدا بەیاریدەی ئامرازی پەیوەندی‌یەوە دەبنە بەرکاری ناراستەوخۆی فرمانی رابوردووی

تێبەڕی کارادیاری سادەو ناسادەی ئیخباری‌و ئینشائی لـــە شێوازی ئەرێ‌و نەرێ‌داو هەمیشـــە راناوەکان دەلکێنـــرێن بە دوای ئامرازە پەیوەندی‌یەکەوە . بەڵام بەرکارە ناراستەوخۆیەکە لـــە دوو مەڵبەندا بەدی دەکرێت :

## مەڵبەندی یەکەم

فرمانەکە سادەبێت ، یان ناسادە ، لە شێوازی ئەرێ‌دا بێت ، یان نەرێ . ئەگەر بەرکاری راستەوخۆی فرمانەکە لە رستەدا باس کرابوو ، ئەوا بەرکاری ناراستەوخۆ لە دوو شوێندا دەبینرێت :

**١ ـ لە پێش فرمانەکەوە .**

**٢ ـ لە دوای فرمانەکەوە .**

**١ ـ لەپێش فرمانی رستەکەوە :**

**ا ـ وێنە بۆ پێشکەوتنی لە فرمانی سادەدا :**

بەرخەکەی بۆ | م / مان / ت / تان / ی / یان |

لەوەڕاند ( نەلەوەڕاند )
لەوەڕاندووە ( نەلەوەڕاندووە )
لەوەڕاندبوو ( نەلەوەڕاندبوو )
دەلەوەڕاند ( نەدەلەوەڕاند )
بلەوەڕاندایە ( نەلەوەڕاندایە )
لەوەڕاندبوایە ( نەلەوەڕاندبوایە )
لەوەڕاندبێت ( نەلەوەڕاندبێت )

ب ـ وێنە بۆ پێشکەوتنی لە فرمانی ناسادە ( داڕژاو )دا :

هەنارەکەی لەگەڵ

م
مان
ت
تان
ی
یان

هەڵپرواند ـ هەڵنەپرواند .
هەڵپرواندووە ـ هەڵنەپرواندووە
هەڵپرواندبوو ـ هەڵنەپرواندبوو .
هەڵدەپرواند ـ هەڵنەدەپرواند .
هەڵبپرواندایە ـ هەڵنەپرواندایە .
هەڵپرواندبوایە ـ هەڵنەپرواندبوایە .
هەڵپرواندبێت ـ هەڵنەپرواندبێت .

ج ـ وێنە بۆ پێشکەوتنی لە فرمانی ناسادە ( لێکدراو )دا :

پرپاسکەکەی پێ

م
مان
ت
تان
ی
یان

گرێدا ـ گرێنەدا
گرێداوە ـ گرێنەداوە
گرێدابوو ـ گرێنەدابوو
گرێدەدا ـ گرێنەدەدا
گرێبدایە ـ گرێنەدایە
گرێدابوایە ـ گرێنەدابوایە
گرێدابێت ـ گرێنەدابێت .

٢ ـ لە دواى فرمانەکەوە :

ا ـ وێنە بۆ دواکەوتنی لە فرمانی سادەدا :

سەعاتەکەی

دا ـ نەدا
داوە ـ نەداوە
دابوو ـ نەدابوو
دەدا ـ نەدەدا
بدایە ـ نەدایە
دابوایە ـ نەدابوایە
دابێت ـ نەدابێت

پێ

م
مان
ت
تان
ی
یان .

ب ـ وێنە بۆ دواکەوتنی لە فرمانی ناسادەدا ( داڕژاو ) :

بەرەکەی

ڕاخست ( ڕانەخست )
ڕاخستووە ( ڕانەخستووە )
ڕاخستبوو ( ڕانەخستبوو )
ڕادەخست ( ڕانەدەخست )
ڕابخستایە ( ڕانەخستایە )
ڕاخستبوایە ( ڕانەخستبوایە )
ڕاخستبێت ( ڕانەخستبێت )

بۆ

م
مان
ت
تان
ی
یان

ج ـ وێنە بۆ دواکەوتنی لە فرمانی ناسادە ( لێکدراودا ) :

پرباسکەکەی

گرێدا ـ نەدا
گرێداوە ـ نەداوە
گرێدابوو ـ نەدابوو
گرێدەدا ـ نەدەدا
گرێبدایە ـ نەدابە
گرێدابێت ـ نەدابێت

بۆ

م
مان
ت
تان
ی
یان .

### مەلبەندی دووەم

فرمانەکە سادە بێت ، یان ناسادە ، لە شێوازی ئەرێ و نەرێدا ، ئەگەر بەرکاری راستەوخۆی فرمانەکە لە رستەدا باس نەکرابوو ، ئەوا بەرکاری ناراستەوخۆ لە دوو شوێندا دەبینرێت :

**١ ـ لە پێش فرمانەکەوە**

**٢ ـ لە دوای فرمانەکەوە**

١ ــ لە پێش فرمانەکەوە :

آ ــ وێنە بۆ پێشکەوتنی لە فرمانی سادەدا :

پێ | م، مان، ت، تان، ی، یان | ی

ڕژاند ــ نەڕژاند

ڕژاندووە ــ نەڕژاندووە

ڕژاندبوو ــ نەڕژاندبوو

دەڕژاند ــ نەدەڕژاند

بڕژاندایە ــ نەڕژاندایە

ڕژاندبوایە ــ نەڕژاندبوایە

ڕژاندبێت ــ نەڕژاندبێت .

ب ــ وێنە بۆ پێشکەوتنی لە فرمانی ناسادە ( داڕژاو ) :

لەگەڵ | م، مان، ت، تان، ی، یان | ی

هەڵڕشت ــ هەڵنەڕشت .

هەڵڕشتووە ــ هەڵنەڕشتووە .

هەڵڕشتبوو ــ هەڵنەڕشتبوو .

هەڵدەڕشت ــ هەڵنەدەڕشت .

هەڵبڕشتایە ــ هەڵنەڕشتایە .

هەڵڕشتبوایە ــ هەڵنەڕشتبوایە .

هەڵڕشتبێت ــ هەڵنەڕشتبێت .

ج ـ وێنە بۆ پێشکەوتنی لە فرمانی ناسادە ( لێکدراو ) :

بۆ | م، مان، ت، تان، ی، یان | ی

وونکرد ـ وون‌نەکرد .
وونکردووە ـ وون‌نەکردووە .
وونکردبوو ـ وونەکردبوو
وون‌دەکرد ـ وون‌نەدەکرد .
وون‌بکردایە ـ وون‌نەکردایە .
وونکردبوایە ـ وون‌نەکردبوایە .
وونکردبێت ـ وون‌نەکردبێت .

٢ ـ لە دوای فرمانەکەوە :

ا ـ وێنە بۆ دواکەوتنی لە فرمانی سادەدا :

چاندی ـ نەی‌چاند(١)
چاندوویەتی ـ نەی‌چاندووە
چاندبووی ـ نەی‌چاندبوو
دەی‌چاند ـ نەی‌دەچاند
بی‌چاندایە ـ نەی‌چاندایە
چاندبوایە ـ نەی‌چاندبوایە
چاندبێتی ـ نەی‌چاندبێت

لەگەڵ | م، مان، ت، تان، ی، یان .

---

(١) رستەی‌یەکەم وەها دەخوێنرێتەوە :
چاندبووی لەگەڵم .
نەی‌چاندبوو لەگەڵم .

ب ـ وێنە بۆ دواکەوتنی لە فرمانی ناسادە ( داڕێژاو )دا :

| | | |
|---|---|---|
| هەڵ ـ ی | پرواند ـ نەپرواند | |
| | پرواندووە ـ نەپرواندووە | |
| | پرواندبوو ـ نەپرواندبوو | |
| | دەپرو ند ـ نەدەپرواند | |
| | بپرواندایە ـ نەپرواندایە | |
| | پرو،ندبوایە ـ نەپرواندبوایە | |
| | پرواندبێت ـ نەپرواندبێت | بۆ م مان ت تان ی یان . |

ج ـ وێنە بۆ دواکەوتنی لە فرمانی ناسادەدا ( لێکدراو )دا :

| | | |
|---|---|---|
| تووڕی | دا ـ نەدا | |
| | داوە ـ نەداوە | |
| | دابوو ـ نەدابوو | |
| | دەدا ـ نەدەدا | |
| | بدایە ـ نەدایە | |
| | دا بوایە ـ نەدابوایە | |
| | دابێت ـ نەدابێت | لەگەڵ م مان ت تان ی یان |

## ( ٢ )

# فرمانی رابوردووی تێنەپەڕی کارادیار

راناوە کەسی‌یەکانی کۆمەڵەی A لە رستەدا بەیاریدەی ئامرازی پەیوەندی‌یەوە دەبنە بەرکاری ناراستەوخۆی فرمانی رابوردووی تێنەبەڕی کارادیاری سادەو نسادەی ئیخباری‌و ئینشـــــائی لە شێوازی ئەرێو نەرێداو راناوەکان دەلکێنـــرێن بەدوای ئامرازە پەیوەندی‌یەکەوەوە ، بەڵام بەرکارە ناراستەوخۆیەکە لە رســــــتەدا لە سێ مەڵبەندا بەری دەکرێت .

## مەلبەندی یەکـــەم

لە فرمانی سادەو ناسادەی ئیخباری‌و ئینشائی‌دا لــــە شێوازی ئەرێو نەرێدا ، ئەگەر کارای فرمانەکە لە رستەکەدا باس کرابو ، ئەوا بەرکاری ناراستەوخۆ لە دوو شوێندا بەدی دەکرێت :

**١ ــ لە پێش فرمانەکەوە**

**٢ ــ لە دوای فرمانەکەوە**

**١ ــ لە پێش فرمانەکەوە :**

**أ ــ وێنە بۆ پێشکەوتنی لە فرمانی سادەدا :**

سەگەکە پێ

م
مان
ت
تان
ی
یان
ە

وەڕی ــ نەوەڕی
وەڕیوە ــ نەوەڕیوە
دەوەڕی ــ نەدەوەڕی
وەڕی‌بوو ــ نەوەڕی‌بوو
بوەڕیایە ــ نەوەڕیایە
وەڕی‌بوایە ــ نەوەڕی‌بوایە
وەڕی‌بێت ــ نەوەڕی‌بێت .

**ب ـ وێنە بۆ پێشکەوتنی لە فرمانی نسادەدا ( داڕژاو ) :**

سوارەکە **لەگەڵ**

**م**
**مان**
**ت**
**تان**
**ی**
**یان**

دابەزی ـ دانەبەزی

دابەزیوە ـ دانەبەزیوە

دابەزیبوو ـ دانەبەزیبوو

دادەبەزێت ـ دانابەزێت

دابەزیایە ـ دانەبەزیایە

دابەزیبوایە ـ دانەبەزیبوایە

دابەزیبێت ـ دانەبەزیبێت .

**ج ـ وێنە بۆ پێشکەوتنی لە فرمانی نسادە ( لێکدراو )دا :**

**بەرازەکە لێ**

**م**
**مان**
**ت**
**تان**
**ی**
**یان**

**دوورکەوتەوە ـ نەکەوتەوە**

**دوورکەوتۆتەوە ـ نەکەوتۆتەوە**

**دوورکەوتبووەوە ـ نەکەوتبووەوە**

**دووردەکەوتەوە ـ نەدەکەوتەوە**

**دووربکەوتایەوە ـ نەکەوتایەوە**

**دوورکەوتبوایەوە ـ نەکەوتبوایەوە**

**دوورکەوتبێتەوە ـ نەکەوتبێتەوە .**

٢ ـ لە دوای فرمانەکەوە :

ا ـ وێنە بۆ دواکەوتنی لە فرمانی سادەدا :

درکەکە(١)

ئالا ـ نەئالا
ئالاوە ـ نەئالاوە
ئالابوو ـ نەئالابوو
دەئالا ـ نەدەئالا
بالایە ـ نەئالایە
ئالابوایە ـ نەئالابوایە
ئالابێت ـ نەئالابێت ـ تێ

م
مان
ت
تان
ی
یان

موە .

ب ـ وێنە بۆ دواکەوتنی لە فرمانی ناسادە ( داڕژاو )دا :

سوارەکە

دابەزی ـ دانەبەزی
دابەزیوە ـ دانەبەزیوە
دابەزیبوو ـ دانەبەزیبوو
دادەبەزی ـ دانەدەبەزی
دابەزیایە ـ دانەبەزیایە
دابەزیبوایە ـ دانەبەزیبوایە
دابەزیبێت ـ دانەبەزیبێت لەگەل

م
مان
ت
تان
ی
یان

---

(١) رستەی یەکەم وەها دەخوێنرێتەوە :
درکەکە ئالا لێمەوە .
درکەکە نە ئالا لێمەوە .

ج ـ وێنە بۆ دواکەوتنی لە فرمانی نسادە ( لێکدراو )دا :

| | |
|---|---|
| بوارەکە | بزربو ـ بزرنەبو<br>بزربووە ـ بزرنەبووە<br>بزربو ـ بزرنەبو<br>بزردەبو ـ بزرنەدەبو<br>بزربوایە ـ بزرنەبوایە<br>بزربووبوایە ـ بزرنەبووبوایە<br>بزربێت ـ بزرنەبێت ـ لێ |

| | |
|---|---|
| لێ | م<br>مان<br>ت<br>نان<br>ی<br>یان |

## مەلبەندی دووەم

لە فرمانی سادەو نسادەی ئیجباری‌و ئینشائی‌دا ، لـــە شێوازی ئەری‌و نەری‌دا ، ئەگەر لە رســـــتەکەدا ناوی ( کارا ) نەهێنرابو ، ئەوا بەرکاری نـاراستەوخۆ لە دوو شوێندا بەدی دەکرێت :

۱ ـ لە پێش فرمانەکەوە .

۲ ـ لە دوای فرمانەکەوە .

١ ــ لە پێش فرمانەکەوە :

٢ ــ وێنە بۆ پێشکەوتنی بەرکاری ناراستەوخۆ لە فرمانی سادەدا :

ئێ

م

مان

ت

تان

ی

یان

تۆرا ــ نەتۆرا

تۆراوە ــ نەتۆراوە

تۆرابوو ــ نەتۆرابوو

دەتۆرا ــ نەدەتۆرا

بتۆرایە ــ نەتۆرایە

تۆرابوایە ــ نەتۆرابوایە

تۆرابێت ــ نەتۆرابێت .

ب ـ وێنە ٣: پێشکەوتنی بەرکاری ناراستەوخۆ لە فرمانی ناسادە ( دارِژاو )دا :

| | | |
|---|---|---|
| لەگەڵ | م | |
| | مان | |
| | ت | |
| | تان | |
| | ی | |
| | یان | هەڵ(١)ستا ـ هەڵنەستا |
| | | هەڵستاوە ـ هەڵنەستاوە |
| | | هەڵدەستا ـ هەڵنەدەستا |
| | | هەڵستابوو ـ هەڵنەستابوو |
| | | هەڵبستایە ـ هەڵنەستایە |
| | | هەڵستبوایە ـ هەڵنەستابوایە |
| | | هەڵستابێت ـ هەڵنەستابێت . |

(١) گەلێ جار لە فرمانی ( هەڵستان )پیتی ( ڵ )ی پێشگری ( هەڵ ) بۆ سووکی فڕێدەدرێت ، یان لە خوێندنەوەدا کلۆر دەکرێت و دەگوترێت ( هەستا ) .

ج ـ وێنه بۆ پێشـــكه‌وتنی بەرکاری ناراســـته‌وخۆ له فرمانی ناساده ( لێکدراو )دا :

پێ | م<br>مان<br>ت<br>تان<br>ی<br>یان

ڕەوانەکرد ـ نەکرد
ڕەوانەکردووه ـ نەکردووه
ڕەوانەکردبو ـ نەکردبو
ڕەوانەدەکرد ـ نەدەکرد
ڕەوانەبکردایە ـ نەکردایە
ڕەوانەکردبوایە ـ نەکردبوایە
ڕەوانەکردبێت ـ نەکردبێت .

٢ ـ له دوای فرمانەکەوه :

ا ـ وێنه بۆ دواکەوتنی بەرکاری ناراستەوخۆ له فرمانی سادەدا :

هات ـ نەهات
هاتووه ـ نەهاتووه
هاتبو ـ نەهاتبو
دەهات ـ نەدەهات
بهاتایە ـ نەهاتایە
هاتبوایە ـ نەهاتبوایە
هاتبێت ـ نەهاتبێت

بۆ | م<br>مان<br>ت<br>تان<br>ی<br>یان .

ب ـ وێنـــه بۆ دواکەوتنی بەرکاری ناراســتەوخۆ لـــە فرمانی ناسادە ( دارێژاو )دا :

دانیشت ـ دانەنیشت

دانیشتوە ـ دانەنیشتوە

دانیشتبوو ـ دانەنیشتبوو

دادەنیشت ـ دانەدەنیشت

دانیشتایە ـ دانەنیشتایە

دانیشتبوایە ـ دانەنیشتبوایە

دانیشتبێت ـ دانەنیشتبێت

لەگەڵ

م

مان

ت

تان

ی

یان .

ج ـ وێنە بۆ دواکـــەوبنی بەرکاری ناڕاستەوخۆ لـــــە فرمانی ناسادە ( لێکدراو )دا :

دیاربوو[1] ـ دیارنەبوو
دیاربووە ـ دیارنەبووە
دیاربووبوو ـ دیارنەبووبوو
دیاردەبوو ـ دیارنەدەبوو
دیاربوایە ـ دیارنەبوایە
دیاربووبوایە ـ دیارنەبووبوایە
دیاربێت ـ دیارنەبێت لێ | م
مان
ت
تان
ی
یان .

## هەلبەندی سێیەم

لە فرمانی سادەو نادەی ئیخباری‌و ئینشائی‌دا لـــــە شێوازی ئەرێ‌و نەرێ‌دا ، ئەگەر کارا دیار بێت ، بەرکاری ناراستەوخۆ دووپـــەل ڕەوەستێت ، واتە دەبێت بە دووکەرتەوە ، کەرتێکیان کە راناوە لکاوەکانە

---

(۱) رستەی یەکەم وەها دەخوێنرێتەوە :
دیاربوو لێم .
دیارنەبوو لێم .

پاڵدەدەن بە کاراوە ، کەرتەکەی تریان کە ئامرازە پەیوەندییەکەیە تەنیـ
دەکەوێت لە پێش فرمانەکەوە :

**ا ـ وێنە بۆ دووپەل بوونی بەرکاری ناراستەوخۆ لە فرمانی سادەدا :**

| | | | |
|---|---|---|---|
| سەگەکە | م | | |
| | مان | | |
| | ت | | |
| | تان | | |
| | ی | | |
| | یان | پێ | وەڕی ـ نەوەڕی(۱) |
| | | | وەڕیوە ـ نەوەڕیوە |
| | | | دەوەڕی ـ نەدەوەڕی |
| | | | وەڕیبوو ـ نەوەڕیبوو |
| | | | بوەڕیایە ـ نەوەڕیایە |
| | | | وەڕیبوایە ـ نەوەڕیبوایە |
| | | | وەڕیبێت ـ نەوەڕیبێت . |

(۱) ڕستەی یەکەم وەها دەخوێنرێتەوە : ( سـەگەکەم پێ وەڕی )
واتە : سەگەکە بە من وەڕی .

ب ـ وێنە بۆ دووپەل بوونی بەرکاری ناڕاستەوخۆ لـــە فرمانی ناسادە ( داڕژاو )دا :

پیاوەکە | م / مان / ت / تان / ی / یان | لەگەڵ |

هەڵبەڕی ـ هەڵنەبەڕی

هەڵپەڕیوە ـ هەڵنەپەڕیوە

هەڵپەڕیبوو ـ هەڵنەپەڕیبوو

هەڵدەپەڕی ـ هەڵنەدەپەڕی

هەڵبپەڕیایە ـ هەڵنەپەڕیایە

هەڵپەڕیبوایە ـ هەڵنەپەڕیبوایە

هەڵپەڕیبێت ـ هەڵنەپەڕیبێت

ج ـ وێنـــە بۆ دووپەل بوونی بەرکاری ناراســـتەوخۆ لـــە فرمانی ناسادە ( لێکدراو )دا :

کاردکه
م
مان
ت
تان
ی
یان

لی

ڕوونبوو — ڕوونﻧﻪبوو
ڕوونبووه — ڕوونﻧﻪبووه
ڕوونبووبوو — ڕوونﻧﻪبووبوو
ڕووندەبوو — ڕوونﻧﻪدەبو
ڕوونببوایە — ڕوونﻧﻪبوایە
ڕوونبوبوایە — ڕوونﻧﻪبوبوایە
ڕوونبێت — ڕوونﻧﻪبێت .

( ٣ )

## فرمانی رابوردووی کاراناديار

**١ ـ فرمانی رابوردووی سادەی کاراناديار :**

راناوه کەسی‌یە لکاوەکانی کـــۆمەڵەی A بەياريـــدەی ئامرازی پەیوەندی‌یەوە، دەبنە بەرکاری ناراستەوخۆی فرمانی رابوردووی سادەی کاراناديار :

١ ـ ئەگەر جێگـــری کارا له رســـتەدا ناوی هێنرابوو ، بەرکاری ناراســـتەوخۆی فرمانەکە پێش فرمانەکە دەکـــەوێت ، بەڵام

ووشەکانی لەیەکتر دابڕدەبن ، راناوەلکاوەکان دەلکێـــن بە دوای جێگری کاراوەو ئامرازی پەیوەندی تاك دەکەوێت . وەك :

پووشەکە | م<br>مان<br>ت<br>تان<br>ی<br>یان | بۆ | سوتێنرا ( نەسوتێنرا )<br>سوتێنراوە ( نەسوتێنراوە )<br>سوتێنرابوو ( نەسوتێنرابوو )<br>دەسوتێنرا ( نەدەسوتێنرا )<br>بسوتێنرایە ( نەسوتێنرایە )<br>سوتێنرابوایە ( نەسوتێنرابوایە )<br>سوتێنرابێت ( نەسوتێنرابێت ) .

٢ ــ ئەگەر جێگری کارا لە رستەکەدا باس نەکرابوو ، ئەوا بەرکاری

---

(١) لە رستەی ( پووشەکەم بۆ سوتێنرا ) :

ــ ووشەی ( پووشەکە ) جێگری کارایە .

ــ گرێی ( م بۆ = بۆم ) بەرکاری ناراستەوخۆیە .

ــ ووشـــەی ( سوتێنرا ) فرمانی رابوردووی کاراناديارى سـادەیە .

ناراســــــتەوخۆ ( ئامرازی پەیوەندیو راناوە لکاوەکانی ك A
دیسان پێش فرمانەکە دەکەوون ، وەك :

| | | |
|---|---|---|
| بۆ | م<br>مان<br>ت<br>تان<br>ی<br>یان | سوتێنرا ( نەسوتێنرا )<br>سوتێنراوە ( نەسوتێنراوە )<br>سوتێنرابوو ( نەسوتێنرابوو )<br>دەسوتێنرا ( نەدەسوتێنرا )<br>بسوتێنرایە ( نەسوتێنرایە )<br>سوتێنرابوایە ( نەسوتێنرابوایە )<br>سوتێنرابێت ( نەسوتێنرابێت ) . |

**ب ـ فرمانی رابوردووی ناسادە ( داڕژاو )ی کاراناديار :**

راناوە کەسی یە لکاوەکانی کــومەڵەی A بەیاریدەی ئامرازی پەیوەندیەوە ، دەبنە بەرکاری ناراستەوخۆی فرمانی رابوردووی ناسادە (داڕژاو )ی کاراناديار :

١ ـ ئەگەر جێگری کارا لە رستەدا باس کرابوو ، بەرکاری ناراستەوخۆ ، پێش فرمانی رســــتەکە دەکەوێت . بەڵام وشــــەکانی لەیەکتر

دابڕدەبن(١) . راناوە لکاوەکان دەلکێن بە جێگری کاراوەو ئامرازی پەیوەندی تەنیا دەکەوێت ، وەك :

کارەکە

م

مان

ت

تان

ی

یان

پێ

ڕاپەڕێنرا ( ڕانەپەڕێنرا )

ڕاپەڕێنراوە ( ڕانەپەڕێنراوە )

ڕاپەڕێنرابوو ( ڕانەپەڕێنرابوو )

ڕادەپەڕێنرا ( ڕانەدەپەڕێنرا )

ڕاپەڕێنرایە ( ڕانەپەڕێنرایە )

ڕاپەڕێنرابوایە ( ڕانەپەڕێنرابوایە )

ڕاپەڕێنرابێت ( ڕانەپەڕێنرابێت )

٢ ـ ئەگەر جێگـــــری کارا لە رســــــتەدا باس نەکرابوو ، بەرکاری ناراستەوخۆ ، کە لە ئامرازی پەیوەندیو راناوە کەسییە لکاوەکان

---

(١) مەبەســـــت ئامرازی پەیوەنـــدیو رانـــاوەکانی بەرکاری ناراستەوخۆیە .

پێکدێت . دەکەوێتە پێش فرمانی ڕستەکەوە ، وەك :

پێ(۱)

م
مان
ت
تان
ی
یان

ڕاپەڕێنرا ( ڕانەپەڕێنرا )
ڕاپەڕێنراوە ( ڕانەپەڕێنراوە )
ڕاپەڕێنرابوو ( ڕانەپەڕێنرابوو )
ڕادەپەڕێنرا ( ڕانەدەپەڕێنرا )
ڕاپەڕێنرایە ( ڕانەپەڕێنرایە )
ڕاپەڕێنرابوایە ( ڕانەپەڕێنرابوایە )
ڕاپەڕێنرابێت ( ڕانەپەڕێنرابێت )

**جـ ـ فرمانی رابوردووی ناسادە ( لێکدراو )ی کارانادیار :**

ڕاناوە کەسی‌یە لکاوەکانی کۆمەڵەی A به یاریـــدەی ئامرازی پەیوەندی‌یەوە دەبنە بەرکاری ناراستەوخۆی فرمانی ڕابوردووی نـــاسادە ( لێکدراو )ی کارانادیار :

---

(۱) لەم ڕستەیەدا ( پێم ڕاپەڕێنرا ) :

( پێم ) : بەرکاری ناراستەوخۆیە . ( پێ ) : ئامرازی پەیوەندی‌یەو ( م ) ڕاناوی لکاوەو بۆتە بەرکاری ناراســـــتەوخۆ بە یاریدەی ئامرازی ( پێ )وە .

١ ـ ئه‌گه‌ر جێگری کارا له‌ رسته‌دا باس‌کرابوو ، به‌رکاری ناراسته‌وخۆ پێش فرمانه‌که‌ ده‌که‌وێت ، به‌ڵام له‌م باره‌دا ووشـه‌کانی به‌رکاری ناراسته‌وخۆ له‌یه‌کتر دابڕ ده‌بن ، راناوه‌کان ده‌لکێنرێن به‌دوای جێگری کاراوه‌و ئامرازه‌ په‌یوه‌ندی‌یه‌که‌ تاك ده‌که‌وێت ، وه‌ك :

| | | | |
|---|---|---|---|
| شاره‌که | م | | |
| | مان | | |
| | ت | | |
| | تان | | |
| | ی | | |
| | یان | له‌گه‌ل | گردرا ( گرنه‌درا ) |
| | | | گردراوه ( گرنه‌دراوه ) |
| | | | گردرابوو ( گرنه‌درابوو ) |
| | | | گرده‌درا ( گرنه‌ده‌درا ) |
| | | | گربدرایه ( گرنه‌درایه ) |
| | | | گردرابوایه ( گرنه‌درابوایه ) |
| | | | گردرابێت ( گرنه‌درابێت ) |

٢ ـ ئه‌گه‌ر جێگری کارا له‌رسته‌دا دیارنه‌بوو ، به‌رکاری ناراسـته‌وخۆ

پێش فرمانەکە دەکەوێت‌و ووشەکانی لەیەکتر دابڕنابن ، وەك :

لەگەڵ
م
مان
ت
تان
ی
یان

گرِدرا ( گرِنەدرا )
گرِدراوە ( گرِنەدراوە )
گرِدرابور ( گرِنەدرابور )
گرِدەدرا ( گرِنەدەدرا )
گرِبدرایە ( گرِنەدرایە )
گرِدرابوایە ( گرِنەدرابوایە )
گرِدرابێت ( گرِنەدرابێت ) .

## ( ٤ )

## فرمانی ڕانەبوردووی تێپەڕی کارادیار

ڕاناوە کەسی‌یە لکاوەکانی کۆمەڵەی A لەرستەدا ، بەیاریدەی ئامرازی پەیوەندی‌یەوە دەبنە بەرکاری ناراستەوخۆی فرمانی ڕانەبوردووی تێپەڕی کارا دیاری سادەو ناسادەی ئیخباری‌و ئینشائی لـــە شێوازی ئەرێ‌و نەرێدا ، یان دەلکێنرێن بەدوای ئامرازە پەیوەندی‌یەکەوە ، یـــان لێی‌دابڕدەبن‌و دەچنەپاڵ بەرکاری ڕاستەوخۆ ـ ئەگەر لە ڕستەکەدا ناوی هێنرابوو ، لە هەر دوو بارەکەیاندا ، بەرکاری ناراستەوخۆ پێش فرمانی ڕستەکە دەکەوێت :

١ ـ ئەگەر بەرکاری ڕاستەوخۆ لە ڕستەکەدا باس‌کرابوو ، ئەوا بەرکاری ناراستەوخۆ دەکەوێتە پێش فرمانەکەوە بەڵام دوو بەر دەکەوێت ؛ ڕاناوە لکاوەکان دەچنەپاڵ بەرکارە ڕاستەوخۆیەکەو ئامرازە پەیوەندی‌یەکە تاک دەکەوێت :

**أ ـ وێنە بۆ بەرکاری ناراستەوخۆ لە فرمانی سادەدا :**

پارەکە | ت(١) / تان / ی / یان | بۆ | دە ( نا ) / ب ( نە ) ـــــــ نێر | م(٢) / ین / ێت / ن

---

(١) لەم وێنەیەدا ڕستەی یەکەم وەها دەخوێنرێتەوە :

پارەکەت بۆ دەنێرم

پارەکەت بۆ نانێرم

(٢) مادام ڕاناوەکانی بەرکاری ناراستەوخۆ لە ( ك A ) بە ، دەشێت ڕاناوەکانی بکەری فرمانەکە لە ( ك B ) بێت کە لەمەولا لێی‌دەدوێین .

**ب ـ وێنە بۆ بەرکاری ناراستەوخۆ لە فرمانی ناسادەدا ( داڕژاو ) :**

گوێزەکە

م(١)
مان
ت
تان

دە ( نا )
پێ هەڵ ـــــــ ڕێژ
ب ( نە )

یت
ن
ێت
ن

**ج ـ وێنە بۆ بەرکاری ناراستەوخۆ لە فرمانی ناسادەدا ( لێکدراو )دا :**

دیوانەکە

م
مان
ی
یان

دە ( نا )
لەگەڵ چاپ ـــــــ کە(٢)
ب ( نە )

یت
ن
ات
ن

---

(١) لەم وێنەیەشدا رستەکە دەها دەخوێنرێتەوە :

گوێزەکەم پێ هەڵ دەرێژیت .

گوێزەکەم پێ هەڵ نارێژیت .

(٢) پێتی ( ە ) لە شێوازی کەسی سێیەمدا دەڕوات .

٢ ـ ئەگەر بەرکاری ڕاستەوخۆ لە ڕستەکەدا باس نەکرابوو ، ئەوا بەرکاری ناراستەوخۆ بەبێ گۆڕان دەکەوێتە پێش فرمانەکەوە :

**ا ـ وێنە بۆ بەرکاری ناراستەوخۆ لە فرمانی سادەدا :**

بۆ | م[1] / مان / ی / یان | ده ( نا ) / ب ( نه ) ـــــــ چێن | بت / ن / ێت / ن .

**ب ـ وێنە بۆ بەرکاری ناراستەوخۆ لە فرمانی ناسادە ( داڕێژاو )دا :**

لەگەڵ | م / مان / ی / یان | هەڵ ده ( نا ) / ب ( نه ) ـــــــ کەن | بت / ن / ێت / ن .

**ج ـ وێنە بۆ بەرکاری ناراستەوخۆ لە فرمانی ناسادە ( لێکدراو )دا :**

پێ | م / مان / ی / یان | چاپ ده ( نا ) / ب ( نه ) ـــــــ کە | بت / ن / ات / ـ

---

(١) لەم ڕستەیەدا ( بۆم نەچێنیت ) گرێی ( بۆم ) بەرکاری ناراستەوخۆیە .

## ( ٥ )

# فرمانی رانەبوردووی تێنەپەڕی کارادیار

راناوە کەسی‌یە لکاوەکانی کـ A لە رستەدا بەیاریدەی ئامرازی پەیوەندی‌یەوە لەجیاتی راناوە کەسی‌یە جـــۆرێ‌یەکان دەبنـــە بەرکاری ناراستەوخۆی فرمانی رانەبوردووی تێپەڕی کارادیاری ئیخبـــاری‌و ئینشائی لە شێوازی ئەرێ‌و نەرێ‌داو دەلکێنرێن بەدوای ئامرازەکەوە :

١ ـ ئەگەر کارای فرمانەکە لە رســـــتەکەدا باس‌کرابوو ئەوا بەرکاری ناراستەوخۆ لە شێوازی ئەرێ‌و نەرێ‌دا لە دوو شـــێوەدا پێش فرمانەکە دەکەوێت :

ـــ بە دانەبراوی :

أ ـ وێنە بۆ پێشکەوتنی بە دانەبراوی لە فرمانی سادەدا :

کەوەکە بۆ | م | مان | ت | تان | ی | یان |

دە ( نا )

ـــــــــــ قاسپێنێت .

ب ( نە )

ب ـ وێنە بۆ نیشـــکەوتنی بە دانەبڕاوی لە فرمانی ناســـادە ( داپڕاو )دا :

| | | |
|---|---|---|
| شوانەکە لەگەڵ | م | |
| | مان | |
| | ت | |
| | تان | |
| | ی | داده ( نا ) |
| | یان | ـــــــــ نیشێت . |
| | | داب ( نە ) |

ج ـ وێنە بۆ پێشـــکەوتنی بە دانەبڕاوی لە فرمانی ناســـادە ( لێکدراو )دا :

| | | |
|---|---|---|
| سوارەکە تادێت لێ | م | |
| | مان | |
| | ت | |
| | تان | |
| | ی | دە ( نا ) |
| | یان | دوور ـــــــــ کەوێتەوە |
| | | ب ( نە ) |

ــــ بەدابڕاوی :

**ا ــ وێنە بۆ پێشکەوتنی بە دابڕاوی لە فرمانی سادەدا :**

دڕکەکە

م

مان

ت

تان

ی

یان

تێوە ـــــــــــ ئالێت(١) .

ده ( نا )

ب ( نە )

**ب ــ وێنە بۆ پێشـــــکەوتنی بە دابڕاوی لە فرمانی ناســـــادە ( داڕژاو )دا :**

مەیمونەکە

م

مان

ت

تان

ی

یان

لەگەل هەل ـــــــــــ لوێت .

ده ( نا )

ب ( نە )

---

(١) رستەی یەکەم :

ــــ لە شێوازی ئەرێدا وەها دەخوێنرێتەوە ( دڕکەکەم تێـــوە دەئالێت ) .

ــــ لە شێوازی نەرێدا وەها دەخوێنرێتەوە ( دڕکەکەم تێـــوە نائالێت ) .

ج ـ وێنە بۆ پێشـــــکەوتنی بەدابڕاوی لە فرمانی ناســـــادە ( لێکدراو )دا :

| | | |
|---|---|---|
| خانووەکە | م | |
| | مان | |
| | ت | |
| | تان | |
| | ی | دە ( نا ) |
| | یان | بۆ چۆڵ ـــــــــــ کات . |
| | | ب ( نە ) |

ـ ئەگەر کارای فرمانەکە لە رســـــتەدا باس‌کرابوو ، ئەوا بەرکاری ناراستەوخۆ لە شێوازی ئەرێ‌و نەرێدا بە دانەبڕاوی :

ـــ پێش فرمانەکە دەکەوێت :

أ ـ وێنە بۆ پێشکەوتنی لە فرمانی سادەدا :

| | | |
|---|---|---|
| تێ | م | |
| | مان | |
| | ت | |
| | تان | |
| | ی | دە ( نا ) |
| | یان | ەوە ـــــــــــ نالێت . |
| | | ب ( نە ) |

ب ـ وێنه بۆ پێشکەوتنی له فرمانی ناساده ( داپڕژاو )دا :

لێ | م
مان
ت
تان
ی
یان | لێك
ده ( نا )
لێك ———— چێت .
ب ( نه )

ج ـ وێنه بۆ پێشکەوتنی له فرمانی ناساده ( لێکدراو )دا :

بـۆ | م
مان
ت
تان
ی
یان |
ده ( نا )
چۆڵ ———— کات .
ب ( نه )

ـــ دوای فرمانەکە دەکەوێت :

ا ـ وێنه بۆ دواکەوتنی له فرمانی سادەدا :

ده ( نا )
———— تۆرێت لێ | م
ب ( نه )
مان
ت
تان
ی
یان .

ب ـ وێنە بۆ دواكەوتنی لە فرمانی ناسادە ( دارِژاو ) :

ده ( نا )
هەڵ ـــــــ توتێت لەگەڵ | م
ب ( نە )
مان
ت
تان
ی
یان .

ج ـ وێنە بۆ دواكەوتنی لە فرمانی ناسادە ( لێكدراو )دا :

ده ( نا )
تەڕاو ـــــــ كـات بۆ | م
ب ( نە )
مان
ت
تان
ی
یان .

## ( ٦ )

## فرمانی رانەبوردووی کاراناديار

راناوە كەسی‌یە لكاوەكانی كۆمەڵەی A لە رستەدا بەیاریدەی ئامرازی پەیوەندی‌یەوە دەبنـــە بەركاری ناراســـتەوخۆی فرمانی رانەبوردووی تێنەپەڕی کاراناديارى سادەو ناسادەی ئیخباری‌و ئینشائی لە شێوازی ئەرێ‌و نەرێدا بەڵام :

١ ـ ئەگەر جێگری کارا لە رســــــتەکەدا باس‌کرابوو ، ئەوا بەرکاری ناراســــتەوخۆ بە دابڕاوی دەکەوێتە پێش فرمانەکەوە ، واتە راناوەکانی کۆمەڵـــەی A لەبری ئەوە بلکێن بە دوای ئامرازە پەیوەندی‌یەکـــەوە دەلکێن بەدوای جێگـــری کاراوەو ئامرازە پەیوەندی‌یەکە بە تەنیا دەمێنێتەوە ، وەك :

**أ ـ وێنە بۆ پێشـــکەوتنی بەرکاری ناراســـتەوخۆ لە فرمانی سادەدا :**

نامەکە | م | مان | ت | تان | ی | یان | بۆ ـــــــ هێنرێت .

(دە ( نا ) / ب ( نە ))

**ب ـ وێنە بۆ پێشکەوتنی بەرکاری ناراستەوخۆ لە فرمانی ناسادە ( داڕژاو )دا :**

دارەکان | م | مان | ت | تان | ی | یان | بۆ هەڵ ـــــــ پەچڕێت .

(دە ( نا ) / ب ( نە ))

**ج ـ وێنه بۆ پێشکەوتنی بەرکاری ناڕاستەوخۆ له فرمانی ناساده ( لێکدراو )دا :**

زووره‌که

م
مان
ت
تان
ی
یان

بۆ بۆباغ ده ( نا ) / ب ( نه ) ———— کرێت .

٢ ـ ئه‌گەر جێگری کارا له رســـــتەدا باس نه‌کرابوو ، ئه‌وا بەرکاری ناڕاستەوخۆ به دانەبڕاوی ده‌کەوێته :

— یان پێش فرمانه‌که‌وه .
— یان دوا فرمانه‌که‌وه .
— له پێش فرمانه‌که‌وه :

**أ ـ وێنه بۆ پێشـــکەوتنی بەرکاری ناڕاســـتەوخۆ له فرمانی ساده‌دا :**

بـۆ

م
مان
ت
تان
ی
یان

ده ( نا ) / ب ( نه ) ———— چێنرێت .

ب ـ وێنە بۆ پێشکەوتنی بەرکاری ناراستەوخۆ لە فرمانی ناسادە ( داڕژاو )دا :

پێ | م<br>مان<br>ت<br>تان<br>ی<br>یان | ڕۆ ــــــــ دەکرێت . (دە ( نا ) / ب ( نە ))

ج ـ وێنە بۆ پێشکەوتنی بەرکاری ناراستەوخۆ لە فرمانی ناسادە ( لێکدراو )دا :

بـۆ | م<br>مان<br>ت<br>تان<br>ی<br>یان | خڕ ــــــــ کرێتەوە . (دە ( نا ) / ب ( نە ))

ـــ لەدوای فرمانەکەوە :

ا ـ وێنە بۆ دواکەوتنی بەرکاری ناراستەوخۆ لە فرمانی سادەدا :

دەخوسێنرێت بـۆ | م<br>مان<br>ت<br>تان<br>ی<br>یان .

**ب ـ وێنە بۆ دواکەوتنی بەرکاری ناڕاستەوخۆ لە فرمانی ناسادە ( داڕژاو)دا :**

ڕۆدەکرێت لەگەڵ | م
مان
ت
تان
ی
یان .

**ج ـ وێنە بۆ دواکەوتنی بەرکاری ناڕاستەوخۆ لە فرمانی ناسادە ( لێکدراو )دا :**

کۆدەکرێتەوە پێ | م
مان
ت
تان
ی
یان .

## ( ٧ )

# فرمــانی ئەمری تێپەڕ

ڕاناوە کەسی‌یە لکاوەکانی کۆمەڵەی A لـــە ڕستەدا لەجیاتی ڕاناوە کەسی‌یە جوێ‌یەکان بە یاریدەی ئامرازی پەیوەندی‌یەوە دەبنــــە بەرکاری ناڕاســـــتەوخۆی فرمانی ئەمری تێپەڕی سادەو ناسادە لـــە

شێوازی ئەرێ و نەرێ داو هەمیشە یان لەپێش فرمانەکەوە دێت . یـان لە دوایەوە :

**(۱) هاتنی لەپێش فرمانەکەوە :**

ئەگەر بەکاری راستەوخۆ لە رستەکەدا باس کرابوو ، ئەوا بەرکاری ناراســـــتەوخۆ :

**۱ ـ بە دانەبڕاوی پێش فرمانەکە دەکەوێت :**

**ا ـ وێنە بۆ بەرکاری ناراستەوخۆی فرمانی ئەمری سادە :**

چراکان **لەگەڵ** | **م** / **مان** / **ی** / **یان** | **دا** بکوژێننەوە ، مەکوژێننەوە ، .

**ب ـ وێنە بۆ بەرکاری ناراستەوخۆی فرمانی ئەمری نـاســـادە ( داڕژاو ) :**

کوڕینە بارەکە **لەگەڵ** . | **م** / **مان** / **ی** / **یان** | **دا** تۆزێ هــــەڵ بڕن

( هەڵ مەبڕن )

**ج ـ وێنە بۆ بەرکاری ناراســتەخۆی فرمانی ئەمری نـاســادە ( لێکدراو ) :**

جوتیارینە بەڕازەکە ئێو **بۆ** | **م** / **مان** / **ی** / **یان** | بۆڕبدەن ( مەدەن ) .

٢ ـ بە دابڕاوی پێش فرمانەکە دەکەوێت :

أ ـ وێنە بۆ بەرکاری ناراستەوخۆی فرمانی ئەمری سادە :

کەوەکە | م
مان
ی
یان | بۆ بنێرە ( مەنێرە ) .

دتوانین لەبری بەرکاری راستەوخۆ ، واتە لەبری ( کەوەکە ) ڕاناوی بەکار بهێنین و بیخەینە دوای ڕاناوەکانی بەرکاری ناراستەوخۆوە و بڵێین :

بـــۆ | م
مان
ی
یان | ی بنێرە ( مەنێرە )(١) .

ب ـ وێنە بۆ بەرکاری ناراستەوخۆی فرمانی ئەمری ناســـادە ( داڕێژاو ) :

کۆڵەکە | م
مان
ی
یان | لەگەڵ هەڵبکرە ( مەگرە ) .

---

(١) بەڵام لەم بارەدا بەرکاری ناراستەوخۆ دەچێتـــەوە شێوازی دانەبڕاوی ، واتـــە راناوە لکاوەکانی ك A دەچنـــەوەپاڵ ئامرازی پەیوەندییەکە .

دیسان دەتوانین لەبری بەرکاری راستەوخۆ ؛ واتە لەبری ( کوڵەکە ) راناوێ بەکار بهێنین و بیخەینە دوای ڕاناوەکانی بەرکاری ناراستەوخۆوەو بڵێین :

لەگەڵ
م
مان
ی
یان ی هەڵبگرە ( هەڵمەگرە ) .

**ج ـ وێنە بۆ بەرکاری ناراستەخۆی فرمانی ئەمری ناسادە ( لێکدراو ) :**

دارتاشەکە
م
مان
ی
یان بۆ بانگبکە ( مەکە ) .

دەتوانین لەبری بەرکاری راستەوخۆ ، واتە ( دارتاشەکە ) راناوێ بەکار بهێنین و بیخەینە دوای ڕاناوەکانی بەرکاری ناراستەوخۆو بڵێین :

بۆ
م
مان
ی
یان ی بانگبکە ( مەکە ) .

ـــ بەڵام ئەگەر بەرکاری راستەوخۆ لە ڕستەکەدا ، باسنەکرابوو ، ئەوا

بەرکاری ناراستەوخۆ ، هەر بە دانەبڕاوی پێش فرمانەکە دەکەوێت :

**ا ـ وێنە بۆ بەرکاری ناراستەوخۆی فرمانی ئەمری سادە :**

بۆ | م
مان
ی
یان | بنووسە ( مەنووسە ) .

**ب ـ وێنە بۆ بەرکاری ناراستەوخۆی فرمانی ئەمری ناسادە ( داڕێژاو ) :**

پێ | م
مان
ی
یان | ڕۆبکەن ( ڕۆمەکەن ) .

**ج ـ وێنە بۆ بەرکاری ناراستەوخۆی فرمانی ئەمری ناسادە ( لێکدراو ) :**

لێ | م
مان
ی
یان | کۆبکەنەوە ( کۆمەکەنەوە ) .

**٢ ـ هاتنی لە دوای فرمانەکەوە :**

ـ ئەگەر بەرکاری ڕاستەوخۆ لە ڕستەکەدا باسکرابوو ، ئەوا بەرکاری ناراستەوخۆ بە دانەبڕاوی دەکەوێتە دوای فرمانەکەوە :

ا ـ وێنە بۆ بەرکاری ناراستەوخۆی فرمانی ئەمری سادە :

تۆوەکـــە بچێنــە بۆ | م
مان
ی
یان |

دەتوانین لەبری بەرکاری راسـتەوخۆ ( تووەکە ) راناوێ بەکاربهێنین و بیخەینە دوای نیشـانەی ( ب ) لە فرمانە ئەمرەکەدا ، وەك :

بیچێنـــــــــە بـۆ | م
مان
ی
یان |

ب ـ وێنە بۆ بەرکاری ناراستەوخۆی فرمانی ئەمری نائـــــادە ( داڕژاو ) :

بزمارەکان هەڵبکێشنە بۆ | م
مان
ی
یان .

دەتوانین لــــەبری بەرکاری راســـــتەوخۆی ( بزمارەکان ) راناوێ بەکاربهێنین کە لە کەس و ژمارەدا هاوتای بەرکارە راســــتەوخۆیەکە بن بیخەینە دوای پێشگری فرمانەکەوە ، وەك :

هەڵیـــان بکێشـــە بۆ | م
مان
ی
یان .

ج ـ وێنە بۆ بەرکاری ناڕاستەخۆی فرمانی ئەمری ناسادە ( لێکدراو ) :

| | |
|---|---|
| کۆترەکە بەرەڵلا بکە ( مەکە ) **لەگەڵ** | **م** |
| | **مان** |
| | **ی** |
| | **یان** . |

دەتوانین لەبری بەرکاری ڕاستەوخۆی ( کۆترەکە ) ڕاناوی بەکاربهێنین و بیخەینە دوای بەشی یەکەمی فرمانە لێکدراوەکەوە ، وەك :

| | |
|---|---|
| بەرەڵلای بکە ، مەکە ، **لەگەڵ** | **م** |
| | **مان** |
| | **ی** |
| | **یان** . |

ـــ ئەگەر بەرکاری ڕاستەوخۆ لە ڕستەکەدا باس نەکرابوو ، ئەوا بەرکاری ناڕاستەوخۆ بە دانەبڕاوی بەدوای فرمانەکەدا دێت :

**أ ـ وێنە بۆ بەرکاری ناڕاستەوخۆی فرمانی ئەمری سادە :**

| | |
|---|---|
| بخوسێنە ( مەخوسێنە ) **بۆ** | **م** |
| | **مان** |
| | **ی** |
| | **یان** . |

دەتوانین لەبری بەرکارە راستەوخۆیە ناو نەهێنراوەکـــە ، راناوێ بەکار بهێنین‌و بیخەینە دوای نیشانەی ( ب )ی فرمانەکەوە ، وەك :

بیخوسێنە (مەی‌خوسێنە) بۆ

م

مان

ی

یان .

**ب ــ وێنە بۆ بەرکاری ناراســتەوخۆی فرمانی نەمری ناســادە ( داڕژاو ) :**

وەرگـــەرێنە لەگـــەڵ

م

مان

ی

یان .

**دەتوانین لەبری بەرکارە راســـتەوخۆیە باس‌نەکراوەکە . راناوێ بەکاربهێنین‌و بیخەینە دوای پێشگری فرمانە نا ســـادە ( داڕژاو )ەکەوە و بڵێین :**

**وەری‌گـــەرێنـــە لەگـــەڵ**

**م**

**مان**

**ی**

**یان .**

**ج ـ وێنە بۆ بەرکاری ناڕاستەوخۆی فرمانی ئەمری ناسادە (لێکدراو) :**

| | | |
|---|---|---|
| خۆش‌بکە[1] (مەکە) بۆ | م | |
| | مان | |
| | ی | |
| | یان . | |

دەتوانین لەبری بەرکارە راستەوخۆیە باس‌نەکراوەکە : راناوێ بەکاربهێنین‌و بیخەینە دوای (ب ۱) فرمانە لێکدراوەکەوە بەبێ ئەوەی کاربکاتەسەر شوێن‌و رووخاری بەرکارە ناراستەوخۆیەکە ، وەك :

| | | |
|---|---|---|
| خۆشی بکە (مەکە) بۆ | م | |
| | مان | |
| | ی | |
| | یان . | |

---

(۱) هەندێ بۆ سووکی نیشانەی (ب) رێژەی ئەمر فرێدەدەن‌و دەڵێن (خوش‌کە) واتە : ئاگرەکە خۆش‌بکە .

( ٨ )

## فرمانی ئەمری تێنەپەڕ [١]

ڕانـــاوە کەسی‌یە لکاوەکانی کۆمەڵەی A لـــە ڕستەدا لەجێی ڕاناوەکەسی‌یە جوێ‌یەکان بەیاریدەی ئامرازی پەیوەندی‌یەوە دەبنــــە بەرکاری ناڕاستەوخۆی فرمانی ئەمری تێنەپەڕی سادەو ناسادە لـــە شێوازی ئەرێ و نەرێ‌دا :

( ١ )

## فرمانی ئەمری تێنەپەڕی ســـادە

ڕانـــاوە کەسی‌یە لکاوەکانی کۆمەڵەی A لـــە ڕستەدا لەجێی ڕاناوە کەسی‌یە جوێ‌یەکان دەبنە بەرکاری ناڕاستەوخۆی فرمانی ئەمری تێنەپەڕی سادە لە شێوازی ئەرێ و نەرێ‌دا ، لـــە دوو مەڵبەندانەدا دەردەکەوێت :

ا ـ لەپێش فرمانەکەوە ، وەك :

لەگەڵ | م
| مان
| ی
| یان | دا ، وەرە ( مەیە )

---

(١) فرمانی تێنەپەر ، بەرکاری ڕاستەوخۆی ناوێت ، تەنیا بەرکاری ناڕاستەوخۆی دەوێت .

ب ـ لە دوای فرمانەکەوە ، وەک :

وەرە
مەبە
لەگەڵ
م
مان
ی
یان .

( ٢ )

## فرمانی ئەمری تێنەپەڕی ناسادە ( داڕژاو )

رانـــاوە کەسی‌یە لکاوەکانی کۆمەڵەی A لـــە رستەدا لەجێی راناوە کەسی‌یە جوێیەکان دەبنە بەرکاری ناراستەوخۆی فرمانی ئەمری تێنەپەڕی نادسادە ( داڕژاو ) لە شێوازی ئەرێو نەرێدا ؛ وەلـــە دوو مەلبەندا دەردەکەوێت :

ا ـ لەپێش فرمانەکەوە ، وەک :

لەگەڵ
م
مان
ی
یان
دانیشە ( دامەنیشە )

ب ـ لە دوای فرمانەکەوە ، وەک :

دانیشـــە ( دامەنیشـــە ) لەگەڵ
م
مان
ی
یان .

## ( ٢ )

# فرمانی ئەمری تێنەپەڕی ناسادە ( لێکدراو )

راناوە کەسی یە لکاوەکانی کۆمەڵەی *A* لە رستەدا لەجێی راناوە کەسی یە خۆیەکان دەبنە بەرکاری ناڕاستەوخۆی فرمانی ئەمری تێنەپەڕی ناسادە ( لێکدراو ) لە شێوازی ئەمرێو نەمرێدا ، وە لە دوو مەڵبەندا دەردەکەوێت :

ا ـ لەپێش فرمانەکەوە ، وەك :

لێ
م
مان
ی
یان
نزیك بکەوەرەوە ( مەکەوەرەوە ) .

ب ـ لە دوای فرمانەکەوە ، وەك :

نزیك بکەوەرەوە ( مەکەوەرەوە ) لێ
م
مان
ی
یان .

# ئەركی تەواوكـــەر[1]

راناوە كەسی‌یە لكاوەكانی كۆمەڵەی *A* لە رستەدا لە جێی راناوە كەسی‌یە جوێ‌یەكان ، بەبێ یاریدەی ئامرازی پەیوەندی دەبنە :

١ ــ تەواوكەری كارا

٢ ــ تەواوكەری جێگری كارا

٣ ــ تەواوكەری بەركاری راستەوخۆ

٤ ــ تەواوكەری بەركاری ناراستەوخۆ .

## ١ ــ تەواوكەری كارا

## ( ١ )

## ( فرمانی رابوردووی تێپەڕی كاردیار )

**أ ــ فرمانی رابوردووی تێپەڕی كارا دیاری سادە :**

راناوە كەسی‌یە لكاوەكانی كۆمەڵەی *A* لە رستەدا ، بەبێ یاریدەی ئامرازی پەیوەندی لەجێی راناوە كەسی‌یە جوێ‌یەكان دەبنە تەواوكـەری

---

(١) تملك .

کارای فرمانی رابوردووی تێپەڕی کارا دیاری سادەی ئیخباریو ئیشنائی لە شێوازی ئەرێو نەرێدا ، وەك :

**تەواوکەری کارا**

| کارا | ( ك A ) | | |
|---|---|---|---|
| باخەوانەکـــە | م | | |
| | مان | | |
| | ت | | |
| | تان | | |
| | ی | | |
| | یان | دزەکەی | گرت ( نەگرت ) |
| | | | گرتووە ( نەگرتووە ) |
| | | | گرتبوو ( نەگرتبوو ) |
| | | | دەگرت ( نەدەگرت ) |
| | | | بگرتایە نەگرتایە ) |
| | | | گرتبوایە ( نەگرتبوایە ) |
| | | | گرتبێت ( نەگرتبێت ) . |

**ب ـ فرمانی رابوردووی تێپەڕی کارا دیاری ناسادە ( دارێژاو ) :**

راناوە کەسی‌یە لکاوەکانی کۆمەڵەی A لە رستەدا ، بەبێ یاریدەی ئامرازی پەیوەندی لەجێی راناوە کەسی‌یە جوێیەکان دەبنە تەواوکـەری کارای فرمانی رابوردووی تێپەڕی کارا دیاری نـاســـادە ( دارێژاو )ی

ئیخباریو ئینشائی لە شێوازی ئەریو نەریدا ، وەك :

**تەواوکەری کارا**

| **کارا** | **( لە A )** | | |
| --- | --- | --- | --- |
| کچـــەکـە | م | | |
| | مان | | |
| | ت | | |
| | تان | | |
| | ی | | |
| | یان | گوڵەکەی | هەڵوەراند ( هەڵنەوەراند ) |
| | | | هەڵوەراندووە ( هەڵنەوەراندووە ) |
| | | | هەڵوەراندبوو ( هەڵنەوەراندبوو ) |
| | | | هەڵدەوەراند ( هەڵنەدەوەراند ) |
| | | | هەڵبوەراندایە ( هەڵنەوەراندایە ) |
| | | | هەڵوەراندبوایە ( هەڵنەوەراندبوایە ) |
| | | | هەڵوەراندبێت ( هەڵنەوەراندبێت ) . |

**ج ــ فرمانی رابوردووی تێپەڕی کارا دیاری ناسادە ( لێکدراو ) :**

راناوە کەسییە لکاوەکانی کۆمەڵەی $A$ لە رستەدا . بەبێ یاریدەی ئامرازی پەیوەندی لەجێی راناوە کەسییە جوێیەکان دەبنە تەواوکـەری کارای فرمانی رابوردووی تێپەڕی کارا دیاری نــاســـادە ( لێکدراو )ی

ئیخباری‌و ئینشائی له شێوازی ئەرێ‌و نەرێدا . وەك :

| کارا | تەواوکەری کارا ( ك A ) | | |
|---|---|---|---|
| میوانەکە | م | | |
| | مان | | |
| | ت | | |
| | تان | | |
| | ی | | |
| | یان | شارەکەی | بەجێ‌هێشت ( بەجێ‌نەهێشت ) |
| | | | بەجێ‌هێشتووە ( بەجێ‌نەهێشتووە ) |
| | | | بەجێ‌هێشتبوو ( بەجێ‌نەهێشتبوو ) |
| | | | بەجێ‌دەهێشت ( بەجێ‌نەدەهێشت ) |
| | | | بەجێ‌بهێشتایە ( بەجێ‌نەهێشتایە ) |
| | | | بەجێ‌هێشتبوایە ( بەجێ‌نەهێشتبوایە ) |
| | | | بەجێ‌هێشتبێت ( بەجێ‌نەهێشتبێت ) . |

---

(١) ئەگەر راناوە لکاوەکان لەم رستانەدا بگۆڕین بە راناوی جوێ ، رستە نوێیەکان وەهایان لێ‌دێت :

میوانەکەی **مـن** شارەکەی بەجێ‌هێشت .

میوانەکەی **ئێمە** شارەکەی بەجێ‌هێشتووە .

میوانەکەی **تـۆ** شارەکەی بەجێ‌هێشتبوو .

میوانەکەی **ئێوە** شارەکەی بەجێ‌دەهێشت .

میوانەکەی **ئـەو** شارەکەی بەجێ‌بهێشتایە .

میوانەکەی **ئەوان** شارەکەی بەجێ‌هێشتبوایە .

## ( ٢ )

# ( فرمانی رابوردووی تێنەپەڕی کارادیار )

**ا ـ فرمانی رابوردووی تێنەپەڕی کارا دیاری سادە :**

راناوە کەسی‌یە لکاوەکانی کۆمەڵەی *A* لە رستەدا ، بەبێ یاریدەی ئامرازی پەیوەندی دەبنە تەواوکەری کارای فرمانی رابوردووی تێنەپەڕی کارا دیاری سادەی ئیخباری‌و ئینشائی لە شێوازی ئەرێ‌و نەرێدا ، وەك :

| کارا | تەواوکەری کارا ( لە A ) | |
|---|---|---|
| کەلەکە | م | |
| | مان | |
| | ت | |
| | تان | |
| | ی | |
| | یان | بەشـا ( نەبەشـا ) |
| | | بەشاوە ( نەبەشاوە ) |
| | | بەشابوو ( نەبەشابوو ) |
| | | دەبەشا ( نەدەبەشا ) |
| | | بیەشایە ( نەبەشایە ) |
| | | بەشابوایە ( نەبەشابوایە ) |
| | | بەشابێت ( نەبەشابێت ) . |

**ب ـ فرمانی رابوردووی تێنەپەڕی کارا دیاری ناسادە ( داڕێژاو ) :**

راناوە کەسی یە لکاوەکانی کۆمەڵەی A لە رستەدا ، بەبێ یاریدەی ئامرازی پەیوەندی دەبنە تەواوکەری کارای فرمانی رابوردووی تێنەپەڕی کارا دیاری ناسادە ( داڕێژاو )ی ئیخباری و ئینشائی لە شێوازی ئەرێ و نەرێدا ؛ وەك :

| | تەواوکەری کارا ( لە A ) | کارا |
|---|---|---|
| | م | چێشتەکە |
| | مان | |
| | ت | |
| | تان | |
| | ی | |
| هەڵچوو ( هەڵنەچوو ) | یان | |
| هەڵچووە ( هەڵنەچووە ) | | |
| هەڵچووبوو ( هەڵنەچووبوو ) | | |
| هەڵدەچوو ( هەڵنەدەچوو ) | | |
| هەڵبچوایە ( هەڵنەچوایە ) | | |
| هەڵچووبوایە ( هەڵنەچووبوایە ) | | |
| هەڵبچێت ( هەڵنەچێت ) . | | |

**ج ـ فرمانی رابوردووی تێنەپەڕی کارا دیاری ناسادە ( لێکدراو ) :**

راناوە کەسی یە لکاوەکانی کۆمەڵەی A لە رستەدا ، بەبێ یاریدەی ئامرازی پەیوەندی دەبنە تەواوکەری کارای فرمانی رابوردووی تێنەپەڕی

کارا دیاری ناسادە ( لێکدراو )ی ئیخباری و ئینشائی لە شێوازی ئەرێ و نەرێدا ، وەك :

| کارا | تەواوکەری کارا ( ك A ) | |
|---|---|---|
| کــاکــ | م | |
| | مان | |
| | ت | |
| | تان | |
| | ی | |
| | یان | دواکەوت ( دوانەکەوت ) |
| | | دواکەوتووە ( دوانەکەوتووە ) |
| | | دواکەوتبوو ( دوانەکەوتبوو ) |
| | | دوادەکەوت ( دوانەدەکەوت ) |
| | | دوابکەوتایە ( دوانەکەوتایە ) |
| | | دواکەوتبوایە ( دوانەکەوتبوایە ) |
| | | دواکەوتبێت ( دوانەکەوتبێت ) . |

( ٣ )

## ( فرمانی رانەبوردووی تێپەڕی کارادیار )

### ١ ـ فرمانی رانەبوردووی تێپەڕی سادەی کارادیار :

راناوە کەسی یە لکاوەکانی کۆمەڵەی *A* لە رستەدا ، بەبێ یاریدەی ئامرازی پەیوەندی لەجێی راناوە کەسی یە جوێ یەکان دەبنە تەواوکەری

کارای فرمانی رانەبوردووی تێپەڕی کارا دیاری سـادەی ئیخباریو ئینشائی لە شێوازی ئەرێو نەرێدا ، وەك :

**تەواوکەری کارا**

| ( ك A ) | کارا |
|---|---|
| م | پشیلەکە |
| مان | |
| ت | |
| تان | |
| ی | |
| یان | |

گۆشتەکە | دەخوات ( ناخوات ) .
بخوات ( نەخوات ) .

**ب ــ فرمانی رانەبوردووی تێپەڕی ناسادە ( داڕژاو )ی کارادیار :**

راناوە کەسییە لکاوەکانی کۆمەڵەی $A$ لە رستەدا ، بەپێ یاریدەی ئامرازی پەیوەندی لەجێی راناوە کەسییە جوێیەکان دەبنە تەواوکەری کارای فرمانی رانەبوردووی تێپەڕی کارا دیاری ناسـادە ( داڕژاو )ی ئیخباریو ئینشائی لە شێوازی ئەرێو نەرێدا ، وەك :

**تەواوکەری کارا**

| ( ك A ) | کارا |
|---|---|
| م | جوتیارەکە |
| مان | |
| ت | |
| تان | |
| ی | |
| یان | |

زەوییەکە | هەڵدەکەنێت ( هەڵناکەنێت )
هەڵبکەنێت ( هەڵنەکەنێت ) .

**ج ـ فرمانی رانەبوردووی تێپەڕی نسادە ( لێکدراو ) :**

رانەوە کەسی یە لکاوەکانی کۆمەڵەی $A$ لە رستەدا ، بەبێ یاریدەی ئامرازی پەیوەندی لەجێی راناوە کەسی یە جوێ یەکان دەبنە تەواوکەری کارای فرمانی رانەبوردووی تێپەڕی ناسـاده ( لێکدراو )ی کارادیاری ئیخباری‌و ئینشائی لە شێوازی ئەرێ‌و نەرێدا ، وەك :

| کارا | تەواوکەری کارا ( لە A ) | | |
|---|---|---|---|
| سـوارەکان | م | | |
| | مان | | |
| | ت | | |
| | تان | | |
| | ی | | |
| | یان | کاروانەکە | بەرێدەکات ( بەرێناکات ) |
| | | | بەرێبکات ( بەرێنەکات ) |

## ( ٤ )

## ( فرمانی رانەبوردووی تێنەپەڕی کارادیار )

**ا ـ فرمانی رانەبوردووی تێنەپەڕی کارا دیاری سادە :**

ڕاناوە کەسی یە لکاوەکانی کۆمەڵەی $A$ لە ڕستەدا بەبێ یاریدەی ئامرازی پەیوەندی لەجێی ڕاناوە کەسی یە جوێ یەکان دەبنـە تەواوکەری کارای فرمانی رانەبوردووی تێنەپەڕی کارادیاری سادەی ئیخبـاری‌و

ئینشانی لە شێوازی ئەرێو نەرێدا ، وەك :

**تەواوکەری کارا**

| کارا | (ك A ) | |
| --- | --- | --- |
| کـــەبوو | م<br>مان<br>ت<br>تان<br>ی<br>یان | دەبڕێت ، نابڕێت ، بېڕێت ، نەبڕێت ) . |

**ب ــ فرمانی رانەبوردووی تێنەپەڕی ناسادە ( داڕێژاو ) :**

راناوە کەسییە لکاوەکانی کۆمەڵەی $A$ لە رستەدا ، بەبێ یاریدەی ئامرازی پەیوەندی لەجێی راناوە کەسییە جۆێەکان دەبنـــە تەواوکەری کارای فرمانی رانەبوردووی تێنەپەڕی ناســـادە ( داڕێژاو )ی کارادیاری ئیخباریو ئینشانی لە شێوازی ئەرێو نەرێدا ، وەك :

**تەواوکەری کارا**

| کارا | (ك A ) | |
| --- | --- | --- |
| کالـەکـــــە | م<br>مان<br>ت<br>تان<br>ی<br>یان | **تێدەبەڕێت ، تێنابەڕێت ، تێبەڕێت ، تێنەبەڕێت ) .** |

### ج ـ فرمانی رانەبوردووی تێنەپەڕی نسادە ( لێکدراو ) :

راناوە کەسی‌یە لکاوەکانی کۆمەڵەی $A$ لە رستەدا ، بەبێ یاریدەی ئامرازی پەیوەندی لەجێی راناوە کەسی‌یە جوێ‌یەکان دەبنـە تەواوکەری کارای فرمانی رانەبوردووی تێنەپەڕی ناســادە ( لێکدراو )ی ئیخباریی‌و ئینشائی لە شێوازی ئەرێ‌و نەرێ‌دا ، وەك :

**تەواوکەری کارا**

| کارا | ( لە A ) | |
|---|---|---|
| جوتیـارەکــە | م | |
| | مان | |
| | ت | |
| | تان | |
| | ی | |
| | یان | رەنجدەدات ( رەنجنادات ) |
| | | رەنجبدات ( رەنجنەدات ) . |

## ٢ ـ تەواوکەری جێگری کارا

### ( ١ )

### فرمانی رابوردووی کاراناديار

**ا ـ فرمانی رابوردووی کاراناديارى سادە :**

راناوە کەسییە لکاوەکانی کۆمەڵەی $A$ لە رستەدا ، بەبێ یاریدەی ئامرازی پەیوەندی لەجێی راناوە کەسییە جوێیەکان دەبنە تەواوکەری جێگری کرای فرمانی رابوردووی کاراناديارى سادەی ئیخباری‌و ئینشائی لە شێوازی ئەرێ‌و نەرێدا ، وەك :

| جێگری کارا | تەواوکەری جێگری کارا ( ك A ) | |
|---|---|---|
| جـوانووەکـــە | م<br>مان<br>ت<br>تان<br>ی<br>یان | فرۆشرا ( نەفرۆشرا )<br>فرۆشراوە ( نەفرۆشراوە )<br>فرۆشرابوو ( نەفرۆشرابوو )<br>دەفرۆشرا ( نەدەفرۆشرا )<br>بفرۆشرایە ( نەفرۆشرایە )<br>فرۆشرابوایە ( نەفرۆشرابوایە )<br>فرۆشرابێت ( نەفرۆشرابێت ) . |

**ب ـ فرمانی رابوردووی کاراناديارى ناساده ( داڕێژاو ) :**

راناوه كەسی‌یه لكاوەكانی كۆمەڵەی $A$ له رستەدا ، بەبێ یاریدەی ئامرازی پەیوەندی لەجێی راناوه كەسی‌یه جوێ‌یەكان دەبنە تەواوكەری جێگری كارای فرمانی رابوردووی کاراناديارى سادەی ئیخباری‌و ئینشائی له شێوازی ئەرێ‌و نەرێدا ، وەك :

| جێگری كارا | كارا ( ك A ) | تەواوكەری جێگری |
| --- | --- | --- |
| چـــــاو | م<br>مان<br>ت<br>تان<br>ی<br>یان | هەڵگلۆفرا ( هەڵنەگلۆفرا )<br>هەڵگلۆفراوە ( هەڵنەگلۆفراوە )<br>هەڵگلۆفرابوو ( هەڵنەگلۆفرابوو )<br>هەڵدەگلۆفرا ( هەڵنەدەگلۆفرا )<br>هەڵبگلۆفرایە ( هەڵنەگلۆفرایە )<br>هەڵگلۆفرابوایە ( هەڵنەگلۆفرابوایە )<br>هەڵگلۆفرابێت ( هەڵنەگلۆفرابێت ) . |

**ج ـ فرمانی رابوردووی کاراناديارى ناساده ( لێكدراو ) :**

راناوه كەسی‌یه لكاوەكانی كۆمەڵەی $A$ له رستەدا ، بەبێ یاریدەی ئامرازی پەیوەندی لەجێی راناوه كەسی‌یه جوێ‌یەكان دەبنە تەواوكەری

کارای فرمانی رابوردووی کاراناديارى نـاســـاده ( داڕژاو )ی ئیخباری و ئینشائی له شێوازی ئەرێ و نەرێدا ، وەك :

تەواوکەری

جێگری

کارا ( ك A )　　جێگری کارا

دیوارەکــــــه

م

مان

ت

تان

ی

یان

سواغدرا ( سواغنەدرا )

سواغدراوە ( سواغنەدراوە )

سواغدرابوو ( سواغنەدرابوو )

سواغدەدرا ( سواغنەدەدرا )

سواغبدرایە ( سواغنەدرایە )

سواغدرابوایە ( سواغنەدرابوایە )

سواغدرابێت ( سواغنەدرابێت ) .

## ( ٢ )

# فرمانی رانەبوردووی کاراناديار

### ١ ـ فرمانی ڕانەبوردووی سادەی کاراناديار :

راناوە کەسییەکانی کۆمەڵەی *A* لە رستەدا ، بەپێی پاریدەی ئامرازی پەیوەندی لەجێی راناوە کەسییە جوێیەکان دەبنە تەواوکەری

جێگری کارای فرمانی ڕانەبوردووی سـادەی کارانادیاری ئێخباریو ئینشـائی لە شێوازی ئەرێو نەرێدا ، وەك :

**تەواوکەری**

**جێگری**

| **جێگری کارا** | **کارا ( لە A )** | |
|---|---|---|
| هـەویرەکـــە | م | |
| | مان | |
| | ت | |
| | تان | |
| | ی | |
| | یان | دەشێلرێت ، ناشێلرێت ، |

بشێلرێت ( نەشێلرێت ) .

**ب ـ فرمانی ڕانەبوردووی ناسادە ( داڕژاو )ی کارانادیار :**

ڕاناوە کەسییە لکاوەکانی کۆمەڵەی A لە ڕستەدا ، بەبێ یاریدەی ئامرازی پەیوەندی لەجێی ڕاناوە کەسییە جۆییەکان دەبنە تەواوکەری جێگری کارای فرمانی ڕانەبوردووی ناسـادە ( داڕژاو )ی کاراناداری ئێخباریو ئینشائی لە شێوازی ئەرێو نەرێدا ، وەك :

**تەواوکەری**

**جێگری**

| **جێگری کارا** | **کارا ( لە A )** | |
|---|---|---|
| دەرگـاکـــە | م | |
| | مان | |
| | ت | |
| | تان | |
| | ی | |
| | یان | دادەخرێت ( داناخرێت ) |

دابخرێت ( دانەخرێت ) .

**ج ـ فرمانی رانەبوردووی ناسادە ( لێكدراو )ی كاراناديار :**

راناوە كەسی‌یە لكاوەكانی كۆمەلەی $A$ لە رستەدا ، بەبێ یاریدەی ئامرازی پەیوەندی لەجێی راناوە كەسی‌یە جوێ‌یەكان دەبنە تەواوكەری جێگری كارای فرمانی رانەبوردووی ناسادە ( لێكدراو )ی كاراناديباری ئیخباری‌و ئینشانی لە شێوازی ئەرێ‌و نەرێدا ، وەك :

| جێگری كارا | كارا ( ك A ) | تەواوكەری جێگری |
|---|---|---|
| ژوورەكە | م<br>مان<br>ت<br>تان<br>ی<br>یان | كەسك‌دەدرێت ( كەسك‌نادرێت )<br>كەسك‌بدرێت ( كەسك‌نەدرێت ) . |

# ٣ ــ تەواوکەری بەرکاری ڕاستەوخۆ

## ( ١ )

## فرمانی ڕابوردووی تێپەڕی کاردیار

### ١ ــ فرمانی ڕابوردووی تێپەڕی کاردیاری سادە :

ڕانـــاوە کەسی‌یە لکاوەکانی کۆمەڵـــەی *A* لە ڕستەدا دەبنـــە تەواوکەری بەرکاری ڕاستەوخۆی هەموو دەمەکانی فرمانی ڕابوردووی تێپەڕی سادەی ئیخباری‌و ئینشائی لە شێوازی ئەرێ‌و نەرێ‌دا ، وەك دەبینین ئەم ئەرکە :

ــــ بەبێ یاریدەی ئامرازی پەیوەندی پێك دێت .

ــــ بەدوای ئـــەم ڕانـــاوە تەواوکـــەرانەدا ، ڕانـــاوی بکەر ك *A* ) دێت ، وەك :

| بەرکاری(١) ڕاستەوخۆ | تەواوکەری بەرکار (ك A) | بکەری فرمان (ك A) | |
|---|---|---|---|
| کـــەوەکـــە | م | ی | |
| | مان | یان | |
| | ت | م | |
| | تان | مان | |
| | ی | ت | |
| | یان | تان | هێنا ( نەهێنـــا ) . |
| | | | هێناوە ( نەهێناوە ) . |
| | | | هێنابوو ( نەهێنابوو ) . |
| | | | دەهێنا ( نەدەهێنا ) . |
| | | | بهێنایە ( نەهێنایە ) . |
| | | | هێنابوایە ( نەهێنابوایە ) . |
| | | | هێنابێت ( نەهێنابێت ) . |

---

(١) ڕستەی یەکەم وەها دەخوێنرێتەوە ( کەوەکەمی هێنا ) ، بەڵام ئەگەر تەواوکەری بەرکاری ڕاستەوخۆ بکرێت بە ڕاناوی جوێ ، ڕستەکە وەها دەخوێنرێتەوە ( کەوەکەی منی هێنا ) .

ب فرمانی رابوردووی تێپەڕی کارا دیاری ناسادە ( دارێژاو ) :

راناوە کەسی‌یە لکاوەکانی کۆمەڵـــەی *A* لە رستەدا دەبنـــە تەواوکەری بەرکاری راستەوخۆی هەموو دەمەکانی فرمانی رابوردووی تێپەڕی ناسادەی ئیخباری‌و ئینشائی لە شـــێوازی ئەرێ‌و نەرێدا ؛ وەك دەبینین :

ــ ئەرکەکە بەبێ یاریدەی ئامرازی پەیوەندی پێك دێت .

ــ بـــەدوای رانـــاوە تەواوکـــەرەکاندا ، رانـــاوی بکەر ( ك *A* ) دێت ، وەك :

| بەرکاری راستەوخۆ | تەواوکەری بەرکار ( ك A ) | بکەری فرمـان ( ك A ) | |
| --- | --- | --- | --- |
| چەفتەکـــە | م | ی | |
| | مان | یان | |
| | ت | م | |
| | تان | مان | |
| | ی | ت | |
| | یان | تان | هەڵبەست ( هەڵنەبەست ) . |
| | | | هەڵبەستووە ( هەڵنەبەستووە ) . |
| | | | هەڵبەستبوو ( هەڵنەبەستبوو ) . |
| | | | هەڵدەبەست ( هەڵنەدەبەست ) . |
| | | | هەڵبەستایە ( هەڵنەبەستایە ) . |
| | | | هەڵبەستبوایە ( هەنەبەستبوایە ) . |
| | | | هەڵبەستبێت ( هەڵنەبەستبێت ) . |

ج ـ فرمانی رابوردووی تێپەڕی کاردیاری ناسادە ( لێکدراو ) :

راناوە کەسیبە لکاوەکانی کۆمەڵەی $A$ لە رستەدا دەبنە تەواوکەری بەرکاری راستەوخۆی هەموو دەمەکانی فرمانی رابوردووی تێپەڕی ناسادەی ئیخباریو ئینشائی لە شێوازی ئەرێو نەرێدا ، وەك دەبینین :

ــ ئەرکەکە بەبێ یاریدەی ئامرازی پەیوەندی پێك دێت .

ــ بەدوای راناوە تەواوکەرەکاندا ، راناوی بکەر ( ك $A$ ) دێت ، وەك :

| بەرکاری راستەوخۆ | تەواوکەری بەرکار ( ك A ) | بکەری فرمان ( ك A ) | |
|---|---|---|---|
| نەمسەبەکە | م | ی | |
| | مان | یان | |
| | ت | م | |
| | تان | مان | |
| | ی | ت | |
| | یان | تان | تاودا ( تاونەدا ) . |
| | | | تاوداوە ( تاونەداوە ) . |
| | | | تاودابوو ( تاونەدابوو ) . |
| | | | تاودەدا ( تاونەدەدا ) . |
| | | | تاوبدایە ( تاونەدایە ) . |
| | | | تاودابوایە ( تاونەدابوایە ) . |
| | | | تاودابێت ( تاونەدابێت ) . |

## ( ٢ )

# فرمانی ڕانەبوردووی تێپەڕی کارادیار

راناوە کەسی‌یە لکاوەکانی کۆمەڵەی $A$ لە ڕستەدا لەجیاتی راناوە کەسی‌یە جوێ‌یەکان دەبنە تەواوکەری بەرکاری راستەوخۆی فرمانی ڕانەبوردووی تێپەڕی کارادیاری سادەو ناسادەی ئیخباری‌و ئینشائی لە شێوازی ئەرێ‌و نەرێدا ، وە ئەم تەواوکردنەش بەبێ یاریدەی ئامرازی پەیوەندی پێکدێت ، وە بەکسەر راناوە کەسی‌یە تەواوکەرەکان دەلکێنرێن بەدوای بەرکارەوە ، واتە بە دوای تەواوکراوەوە ، بەڵام راناوەکانی بکەر دەبێ لە کۆمەڵەی $B$ بێت‌و بخرێتەدوای ڕەگی فرمانەکەوە .

١ ــ وێنە بۆ فرمانی ڕانەبوردووی تێپەڕی کارادیاری سادە :

| بەرکاری راستەوخۆ | تەواوکەر ( ک A ) | ڕێژەو ڕەگی فرمان | راناوی بکەر ( ک B ) |
|---|---|---|---|
| پشتێنەکە | م<br>مان<br>ت<br>تان<br>ی<br>یان | دە ( نا )<br>بەس(١)<br>ب ( نە ) | م<br>ین<br>یت<br>ن<br>ێت<br>ن |

(١) دروستە بە ( بەست )یش بگوترێت .

ب ـ وێنـــه بۆ فرمانی ڕانەبوردووی تێپەڕی کارادیاری ناســادە ( داڕێژاو ) :

| بەرکاری ڕاستەوخۆ | تەواوکەر ( ك A ) | ڕێژەو ڕەگی فرمان | ڕاناوی بکەر ( ك B ) |
|---|---|---|---|
| لێفـــەکـە | م | | |
| | مان | | |
| | ت | | |
| | تان | | |
| | ی | | |
| | یان | هەڵ دە ( نا ) / بـ ( نە ) وەشێن | م |
| | | | ین |
| | | | یت |
| | | | ن |
| | | | یت |
| | | | ن |

ج ـ وێنـــە بۆ فرمانی ڕانەبوردووی تێپەڕی کارادیاری ناســادە ( لێکدراو ) :

| بەرکاری ڕاستەوخۆ | تەواوکەر ( ك A ) | ڕێژەو ڕەگی فرمان | ڕاناوی بکەر ( ك B ) |
| --- | --- | --- | --- |
| منداڵەکە | م / مان / ت / تان / ی / یان | دە ( نا ) / بـ ( نە ) سەرشکێن ـــــــ کە(١) | م / ین / یت / ن / یت / ن |

(١) لە کەسی سێیەمی تاکدا دەڵێین ا دەکات ) .

(٣)

# فرمانی ئه‌مری تێپه‌ڕی ساده‌و ناساده

راناوه كه‌سی‌یه لكاوه‌كانی كۆمه‌ڵه‌ی $A$ له رسته‌دا له‌جێی راناوه كه‌سی‌یه جوێ‌یه‌كان ده‌بنه ته‌واوكه‌ری به‌ركاری راسته‌وخۆی فرمانی ئه‌مری تێپه‌ڕی ساده‌و ناساده له شێوازی ئه‌رێ‌و نه‌رێ‌دا . ئه‌م ته‌واوكردنه‌ش به‌بێ یاریده‌ی ئامرازی په‌یوه‌ندی پێك‌دێت‌و به‌كار راناوه‌كان ده‌لكێنرێن به‌دوای به‌ركاره راسته‌وخۆیه‌كه‌وه ، به‌ڵام راناوه‌كانی بكه‌ر له كۆمه‌ڵه‌ی $B$ ده‌بن‌و ده‌خرێنه دوای ڕه‌گی فرمانه‌كه‌وه .

أ ــ وێنه بۆ فرمانی ئه‌مری تێپه‌ڕی ساده :

| به‌ركاری راسته‌وخۆ | ته‌واوكه‌ر ( له A ) | ڕیزه‌و ڕه‌گی فرمان | راناوی بكه‌ر ( له B ) |
|---|---|---|---|
| كلاوه‌كه | م | | |
| | مان | | |
| | ت | | |
| | تان | | |
| | ی | | |
| | یان | ب ( مه ) به‌خش | ه |
| | | | ن |

ب ــ وێنە بۆ فرمانی ئەمری تێپەڕی ناسادە ( داڕژاو ) :

| بەرکاری راستەوخۆ | تەواوکەر ( ك A ) | ریژەو رەگی فرمان | راناوی بکەر ( ك B ) |
| --- | --- | --- | --- |
| خەرمانەکـــە | م<br>مان<br>ت<br>تان<br>ی<br>یان | هـــەڵ ـ بـ ( مە ) گـر | ە<br>ن |

ج ــ وێنە بۆ فرمانی ئەمری تێپەڕی ناسادە ( لێکدراو ) :

| بەرکاری راستەوخۆ | تەواوکەر ( ك A ) | ریژەو رەگی فرمان | راناوی بکەر ( ك B ) |
| --- | --- | --- | --- |
| کانی‌یەکـــە | م<br>مان<br>ت<br>تان<br>ی<br>یان | لێخـــن بـ ( مە ) کـــە | ...<br>ن |

# ٤ ـ تەواوکەری بەرکاری ناراستەوخۆ

## ( ١ )

## فرمانی رابوردووی تێپەڕی کارادیار

**ا ـ فرمانی رابوردووی تێپەڕی کارا دیاری سادە :**

راناوە کەسییە لکاوەکانی کۆمەڵەی $A$ لە رستەدا لە جێی راناوە کەسییە جوێیەکان بەبێ یاریدەی ئامرازی پەیوەندی دەبنە تەواوکەری بەرکاری ناراستەوخۆی فرمانی رابوردووی تێپەڕی کارادیاری سادەی ئیخباریو ئینشائی لە شێوازی ئەرێو نەرێداو یەکسەر دەلکێنرێن بەدوای ووشە تەواوکراوەکەوە ، وەك :

| | | |
|---|---|---|
| چاکەتەکەم بۆ کوڕەکە | ت | |
| | تان | |
| | ی | |
| | یان | بڕی ( نەبڕی ) |
| | | بڕیوە ( نەبڕیوە ) |
| | | بڕیبوو ( نەبڕیبوو ) |
| | | دەبڕی ( نەدەبڕی ) |
| | | ببڕیایە ( نەبڕیایە ) |
| | | بڕیبوایە ( نەبڕیبوایە ) |
| | | بڕیبێت ( نەبڕیبێت ) . |

**ب ـ فرمانی ڕابوردووی تێپەڕی کارا دیاری ناسادە ( داڕێژاو ) :**

ڕاناوە کەسییە لکاوەکانی کۆمەڵەی $A$ لە ڕستەدا لە جێی ڕاناوە کەسییە جوێیەکان بەبێ یاریدەی ئامرازی پەیوەندی دەبنە تەواوکەری بەرکاری ناڕاستەوخۆی فرمانی ڕابوردووی تێپەڕی کارادیاری ناسادە ( داڕێژاو )ی ئیخباریو ئینشائی لە شێوازی ئەرێو نەرێداو یەکسەر دەلکێنرێن بەدوای ووشە تەواوکراوەکەوە ، وەك :

نامەکەی بە باخەوانەکە | م | مان | ت | تان |

هەڵکەند ( هەڵنەکەند )

هەڵکەندووە ( هەڵنەکەندووە )

هەڵکەندبوو ( هەڵنەکەندبوو )

هەڵدەکەند ( هەڵنەدەکەند )

هەڵبکەندایە ( هەڵنەکەندایە )

هەڵکەندبوایە ( هەڵنەکەندبوایە )

هەڵکەندبێت ( هەڵنەکەندبێت ) .

**ج ـ فرمانی ڕابوردووی تێپەڕی کارادیاری ناسادە ( لێکدراو ) :**

ڕاناوە کەسییە لکاوەکانی کۆمەڵەی $A$ لە ڕستەدا لە جێی ڕاناوە کەسییە جوێیەکان بەبێ یاریدەی ئامرازی پەیوەندی دەبنە تەواوکەری بەرکاری ناڕاستەوخۆی فرمانی ڕابوردووی تێپەڕی کارادیاری ناسادە ( لێکدراو )ی ئیخباریو ئینشائی لە شێوازی

ئەرێ و نەرێدا و بەکەسەر دەلکێنرێن بەدوای ووشە تەواوکراوەکەوە ، وەك :

هێلکەکەت بۆ براکە | م
مان
ی
یان |

پاك کرد ( پاك نەکرد )
پاك کردووە ( پاك نەکردووە )
پاك دەکرد ( پاك نەدەکرد )
پاك بکردایە ( پاك نەکردایە )
پاك کردبوو ( پاك نەکردبوو )
پاك کردبوایە ( پاك نەکردبوایە )
پاك کردبێت ( پاك نەکردبێت ) .

( ٢ )

## فرمانی رابوردووی تێنەپەڕی کارادیار

### ١ ـ فرمانی رابوردووی تێنەپەڕی کارادیاری سادە :

راناوە کەسی یە لکاوەکانی کۆمەڵەی *A* لە رستەدا لە جێی راناوە کەسی یە جوێیەکان بەبێ پاربەدەی ئامرازی پەیوەندی دەبنە تەواوکەری بەرکاری ناراستەوخۆی فرمانی رابوردووی تێنەپەڕی کارادیاری سادەو ناسادە ( داڕژاو )ی ئیخباری و ئینشائی لە شێوازی

ئەرێو نەرێدا و یەکسەر دەلکێنرێن بەدوای ووشە تەواوکراوەکەوە ، وەك :

لەگـــەڵ بـــاوکـ

ت
تان
ی
یان

هاتم ( نەهاتم ) .
هاتووم ( نەهاتووم ) .
هاتبووم ( نەهاتبووم ) .
دەهاتم (نەدەهاتم ) .
بهاتمایە ( نەهاتمایە ) .
هاتبوومایە ( نەهاتبوومایە ) .
هاتبێتم ( نەهاتبێتم ) .

**ب ـ فرمانی رابوردووی تێنەپەڕی کارادیاری ناسادە ( دارِژاو ) :**

راناوە کەسی یە لکاوەکانی کۆمەڵەی $A$ لە رستەدا لە جێی راناوە کەسی یە جـــوێیەکان بەبێ یاریـــدەی ئامرازی پەیوەنـــدی دەبنـــــە تەواوکەری بەرکاری ناڕاســـــتەوخۆی فرمانی رابوردووی تێنەپەڕی کارادیاری ناسادە ( دارِژاو )ی ئیخباریو ئینشائی لە شێوازی ئەرێو نەرێداو یەکسەر دەلکێنرێن بەدوای ووشە تەواوکراوەکەوە ، وەك :

لێتاوەکە بە رانکەکـە

م
مان
ت
تان
ی
یان

دا

هەڵڕژا ( هەڵنەڕژا )
هەڵڕژاوە ( هەڵنەڕژاوە )
هەڵڕژابوو ( هەڵنەڕژابوو )
هەڵدەڕژا ( هەڵنەدەڕژا )
هەڵبڕژایە ( هەڵنەڕژایە )
هەڵڕژابوایە ( هەڵنەڕژابوایە )
هەڵڕژابێت ( هەڵنەڕژابێت ) .

**ج ـ فرمانی رابوردووی تێنەپەڕی کارادیاری ناسادە ( لێکدراو ) :**

ڕاناوە کەسی‌یە لکاوەکانی کۆمەڵەی $A$ لە ڕستەدا لە جێی راناوە کەسی‌یە جوێ‌یەکان بەبێ یاریدەی ئامرازی پەیوەندی دەبنە تەواوکەری بەرکاری ئاراستەوخۆی فرمانی رابوردووی تێنەپەڕی کارادیاری ناسادە ( لێکدراو )ی ئیخباری‌و ئینشائی لە شێوازی ئەری‌و نەری‌داو بەکار دەلکێنرێن بەدوای ووشە تەواوکراوەکەوە ، وەك :

فرۆکەکە لە چاو | م / مان / ت / تان / ی / یان |

وونبوو ( وون‌نەبوو )

وونبووە ( وون‌نەبووە )

وونبووبوو ( وون‌نەبووبوو )

وون‌دەبوو ( وون‌نەدەبوو )

وونبوایە ( وون‌نەبوایە )

وونبووبوایە ( وون‌نەبووبوایە )

وونبووبێت ( وون‌نەبووبێت ) .

( ٣ )

## فرمانی رابوردووی کارانادیار

١ ــ فرمانی رابوردووی کارا نادیاری ساده :

راناوه کەسی‌یەلکاوەکانی کۆمەڵـــەی A لە رستەدا دەبنـــە تەواوکەری فرمانی رابوردووی کاراناد‌یاری سادەی ئیخباری‌و ئینشائی لە شێوازی ئەری‌و نەری‌دا بەبێ یاریدەی ئامرازی پەیوەندی بەکـــەر دەلکێنرێن بەدوای ووشە تەواوکراوەکەوە لە بەشی گوزارەدا ، وەك :

| | | |
|---|---|---|
| گەنمەکە بە دەستارەکە | ت | |
| | تان | |
| | ی | |
| | یان | |
| | م | |
| | مان | هاڕدرا ( نەهاڕدرا ) |
| | | هاڕدراوە ( نەهاڕدراوە ) |
| | | هاڕدرابوو ( نەهاڕدرابوو ) |
| | | دەهاڕدرا ( نەدەهاڕدرا ) |
| | | هاڕدرابوایە ( نەهاڕدرابوایە ) |
| | | هاڕدرابێت ( نەهاڕدرابێت ) . |

**ب ـ فرمانی رابوردووی کارانادیاری ناسادە ( دارِژاو ) :**

راناوە کەسی‌یە لکاوەکانی کۆمەڵەی *A* لە رستەدا بەبێ یاریدەی ئامرازی پەیوەندی لەجێی راناوە کەسی‌یە جوێ‌یەکان لە بەشی گوزارەدا دەبنە تەواوکەری فرمانی رابوردووی کارانادیاری ناسادە ( دارِژاو )ی ئیخباری‌و ئینشائی لە شێوازی ئەرێ‌و نەرێداو بەکــــەر دەلکێنرێن بەدوای ووشە تەواوکراوەکەوە ، وەك :

ئەو پەیکەرە بە چەکوشەکە |
م
مان
ت
تان
ی
یان |
داتاشرا ( دانەتاشرا )
داتاشراوە ( دانەتاشراوە )
داتاشرابوو ( دانەتاشرابوو )
دادەتاشرا ( دانەدەتاشرا )
دابتاشرایە ( دانەتاشرایە )
داتاشرابوایە ( دانەتاشرابوایە )
داتاشرابێت ( دانەتاشرابێت ) .

**ج ـ فرمانی رابوردووی کاراناداری ناسادە ( لێکدراو ) :**

راناوە کەسی‌یە لکاوەکانی کۆمەڵەی $A$ لە رستەدا بەبێ یاریدەی ئامرازی پەیوەندی لەجێی راناوە کەسی‌یە جوێ‌یەکان دەبنە تەواوکەری بەرکاری ناراستەوخۆی فرمانی رابوردووی کاراناداری ناسادە ( لێکدراو )ی ئیخباری‌و ئینشائی لە شێوازی ئەرێ‌و نەرێ‌داو یەکسەر دەلکێنرێن بەدوای ووشە تەواوکراوە ، وەك :

بەرازەکە لەناو جۆگەکە | م / مان / ت / تان / ی / یان | دا

گەمارۆدرا ( گەمارۆنەدرا )

گەمارۆدراوە ( گەمارۆنەدراوە )

گەمارۆدرابوو ( گەمارۆنەدرابوو )

گەمارۆدەدرا ( گەمارۆنەدەدرا )

گەمارۆبدرایە ( گەمارۆنەدرایە )

گەمارۆدرابوایە ( گەمارۆنەدرابوایە )

گەمارۆدرابێت ( گەمارۆنەدرابێت ) .

# ( ٤ )

# فرمانی رانەبوردووی کارادیار

**أ ـ فرمانی رانەبوردووی کارادیاری سادە :**

راناوە کەسی‌یە لکاوەکانی کۆمەڵەی A لــەجێی راناوە کەسی‌یە جوێیەکان لە رستەدا بەبێ یاریدەی ئامرازی پەیوەندی دەبنە تەواوکەری بەرکاری ناراســتەوخۆی فرمانی رانەبوردووی کارادیاری ســادەی نیخباری‌و ئینشائی لە شێوازی ئەرێ‌و نەرێداو بەکــەر دەلکێنــرێن بەدوای ووشە تەواوکراوەکەوە لە بەشی گوزارەدا ، وەك :

نیگارەکە لەســەر تاتەبەردەکە | م / مان / ت / تان / ی / یان | دە ( نا ) / ب ( نە ) ـــــــ کێشم .

**ب ـ فرمانی رانەبوردووی کارادیاری ناسادە ( دارِژاو ) :**

راناوە کەسی‌یە لکاوەکانی کۆمەڵەی A لە رستەدا بەبێ یاریدەی ئامرازی پەیوەندی لەجێی راناوە کەسی‌یە جوێیەکان دەبنە تەواوکەری بەرکاری ناراســتەوخۆی فرمانی رانەبوردووی کارادیاری ناســادەی نیخباری‌و ئینشائی لە شێوازی ئەرێ‌و نەرێداو بەکــــەر دەلکێنرێن

بەدوای ووشە تەواوکراوەکەوە لە بەشی گوزارەدا ، وەك :

وێنەی تۆ لــــە بەرەی دڵ | م / مان / ت / تان / ی / یان | هەڵ دە ( نا ) / ب ( نە ) ــــــــ کەنم .

## ج ـ فرمانی رانەبوردووی کارا دیاری ناسادە ( لێکدراو ) :

راناوە کەسی‌یە لکاوەکانی کۆمەڵەی *A* لە رستەدا لەجێی راناوە کەسی‌یە جوێ‌یەکان دەبنە تەواوکەری بەرکاری ناراستەوخۆی فرمانی رانەبوردووی کارادیاری ناسادەی ئیخباری‌و ئینشائی لە شێوازی ئەرێ‌و نەرێ‌داو یەکسەر دەلکێنرێن بەدوای ووشە تەواوکراوەکەوە لە بەشی گوزارەدا ، وەك :

چەقۆکــــە بەبڕبەندەکــــە | م / مان / ت / تان / ی / یان | لێ دە ( نا ) / ب ( نە ) ــــــــ کەم .

# ( ٥ )

## فرمانی رانەبوردووی کارانادیار

### ا ــ فرمانی رانەبوردووی کارانادیاری سادە :

راناوە کەسی‌یە لکاوەکانی کۆمەڵەی $A$ لە رستەدا لەجێی راناوە کەسی‌یە جوێ‌یەکان بەبێ یاریدەی ئامرازی پەیوەندی دەبنە تەواوکەری بەرکاری ناراستەوخۆی فرمانی رانەبوردووی کاراناد‌یاری ســـادەی ئبخباری‌و ئینشائی لە شێوازی ئەرێ‌و نەرێ‌داو بەکـــار دەلکێنرێن بەدوای ووشە تەواوکراوەکەوە لە بەشی گوزارەدا . وەك :

| | | |
|---|---|---|
| وەردەکـــە بە گاســـنەکە | م | |
| | مان | |
| | ت | |
| | تان | |
| | ی | |
| | یان | دەکێلرێت ( ناکێلرێت ) . |
| | | بکێلرێت ( نەکێلرێت ) . |

### ب ــ فرمانی رانەبوردووی کاراناد‌یاری ناسادە ( داڕژاو ) :

راناوە کەسی‌یە لکاوەکانی کۆمەڵەی $A$ لە رستەدا بەبێ یاریدەی ئامرازی پەیوەندی لەجێی راناوە کەسی‌یە جوێ‌یەکان دەبنە تەواوکەری بەرکاری ناراســـتەوخۆی فرمانی رانەبوردووی کارادیاری نا‌ســـادەی

ئیخباری‌و ئینشائی له شێوازی ئەرێ‌و نەرێ‌داو بەکـەر دەلکێنرێن بە دوای ووشە تەواوکراوەکەوە لە بەشی گوزارەدا . وەك :

بەرەکـە لەســـەر سەکۆکە | م<br>مان<br>ت<br>تان<br>ی<br>یان | را ــــــــــ دە ( نا ) / بـ ( نە ) ــــــــــ خرێت .

جـ ـ فرمانی رانەبوردووی کاراناديارى ناسادە ( لێکدراو ) :

راناوە کەسی‌یە لکاوەکانی کۆمەڵەی $A$ لە رستەدا لەجێی راناوە کەسی‌یە جوێ‌یەکان بەبێ یاریدەی ئامرازی پەیوەندی دەبنە تەواوکەری بەرکاری ناراســتەوخۆی فرمانی رانەبوردووی کارادیاری نـاســادەی ئیخباری‌و ئینشائی لە شێوازی ئەرێ‌و نەرێ‌داو بەکـــەر دەلکێنرێن بەدوای ووشە تەواوکراوەکەوە لە بەشی گوزارەدا ، وەك :

پرســیارەکە بۆ قوتابی‌یەکان | م<br>مان<br>ت<br>تان<br>ی<br>یان | شیکار ــــــــــ دە ( نا ) / بـ ( نە ) ــــــــــ کرێت .

## ( ٦ )

# فرمانی رانەبوردووی تێنەپەڕی کارادیار

### ا ـ فرمانی رانەبوردووی تێنەپەڕی کارادیاری سادە :

راناوە کەسی‌یە لکاوەکانی کۆمەڵەی A لە رستەدا بەبێ یاریدەی ئامرازی پەیوەندی لەبری راناوە کەسی‌یە جوێ‌یەکان دەبنە تەواوکەری بەرکاری ناراستەوخۆی فرمانی رانەبوردووی تێنەپەڕی کارادیاری سادەی ئیخباری‌و ئینشائی لە شێوازی ئەرێ‌و نەرێ‌داو بەکەر دەلکێنرێن بەدوای ووشە تەواوکراوەکەوە لە بەشی گوزارەدا ، وەك :

| | | |
|---|---|---|
| مـن لەگـەڵ پـوور | م | |
| | مان | |
| | ت | |
| | تان | |
| | ی | دەچم (ناچم) |
| | یان | دا ——— بۆ لادێ . |
| | | بچم ( نەچم ) |

### ب ـ فرمانی رانەبوردووی تێنەپەڕی کارادیاری نسادە ( داڕژاو ) :

راناوە کەسی‌یە لکاوەکانی کۆمەڵەی A لە رستەدا لەجیاتی راناوە کەسی‌یە جوێ‌یەکان بەبێ یاریدەی ئامرازی پەیوەندی دەبنە تەواوکەری بەرکاری ناراستەوخۆی فرمانی رانەبوردووی تێنەپەڕی کارادیاری نسادە ( داڕژاو )ی ئیخباری‌و ئینشائی لە شێوازی ئەرێ‌و نەرێ‌داو

بەکـــــــەر دەلکێنرێن بەدوای ووشە تەواوکراوەکەوە لـــــە بەشی گوزارەدا ، وەك :

| | | |
|---|---|---|
| گولـــەکە بـــە دەســـــت | م | |
| | مان | |
| | ت | |
| | تان | |
| | ی | |
| | یان | دە ( نا )<br>ەوە هەل ـــــــــــ وەرێت<br>ب ( نە ) |

ج ـ فرمانی رانەبوردووی تێنەپەڕی کارادیاری ناسادە ( لێکدراو ) :

راناوە کەسی‌یە لکاوەکانی کۆمەلەی $A$ لە رستەدا لەبری رانــاوە کەسی‌یە جوێ‌یەکان بەبێ یاریدەی ئامرازی پەیوەندی دەبنە تەواوکەری بەرکاری ناراســــتەوخۆی فرمانی رانەبوردووی تێنەپەڕی کارادیاری ناسادە ( لێکدراو )ی ئیخباری‌و ئینشائی لە شێوازی ئەرێ‌و نەرێ‌داو یەکسەر دەلکێنرێن بەدوای ووشـــــە تەواوکراوەکەوە لـــــە بەشی گوزارەدا ، وەك :

| | | |
|---|---|---|
| ســــــیروان لـــــە کاکـ | م | |
| | مان | |
| | ت | |
| | تان | |
| | ی | |
| | یان | دە ( نا )<br>زویر ـــــــــــ بێت .<br>ب ( نە ) |

# ( ٧ )

## فرمانی ئەمری تێپەڕ

### ا ـ فرمانی ئەمری تێپەڕی سادە :

راناوە کەسی یە لکاوەکانی کۆمەڵەی $A$ لە رستەدا لەجیاتی راناوە کەسی یە جوێ یەکان بەبێ یاریدەی ئامــــرازی پەیوەندی دەبنـــە تەواوکەری بەرکاری ناراســـــــەوخۆی فرمانی ئەمری تێپەڕی سادە لە شێوازی ئەرێ و نەرێ داو بەکـــــەر دەلکێنرێن بەدوای ووشـــە تەواوکراوەکەوە . وەك :

| | | |
|---|---|---|
| هەیوانەکـــە بـــە گـــــکەکە | م<br>مان<br>ت<br>تان<br>ی<br>یان | بماڵە ( مەماڵە ) . |

### ب ـ فرمانی ئەمری تێپەڕی ناسادە ( داڕژاو ) :

راناوە کەسی یە لکاوەکانی کۆمەڵەی $A$ لە رستەدا لەبری رانـــاوە کەسی یە جوێ یەکان بەبێ یاریدەی ئامرازی پەیوەندی دەبنە تەواوکەری بەرکاری ناراستەوخۆی فرمانی ئەمری تێپەڕی ناسادە ( داڕژاو ) لـــە شێوازی ئەرێ و نەرێ داو بەکــــــەر دەلکێنرێن بەدوای ووشـــــە تەواوکراوەکەوە ، وەك :

| | | |
|---|---|---|
| دیوارەکـــە بـــە پاچەکـــە | م<br>مان<br>ت<br>تان<br>ی<br>یان | هەڵبوەشێنە (هەڵمەوەشێنە) |

**ج ـ فرمانی ئەمری تێپەڕی ناسادە ( لێکدراو ) :**

راناوە کەسی‌یە لکاوەکانی کۆمەڵەی $A$ لە رستەدا لەجیاتی راناوە کەسی‌یە جوێ‌یەکان بەبێ یاریدەی ئامرازی پەیوەندی دەبنە تەواوکەری بەرکاری ناڕاستەوخۆی فرمانی ئەمری تێپەڕی ناسادە ( لێکدراو ) لە شێوازی ئەرێ و نەرێ‌داو بەکەر دەلکێنرێن بە دوای ووشە تەواوکراوەکەوە ، وەك :

بە تۆپەکە

| م | مان | ت | تان | ی | یان |

یاری بکە ( یاری‌مەکە ) .

**( ٨ )**

## فرمانی ئەمری تێنەپەڕ

**أ ـ فرمانی ئەمری تێنەپەڕی سادە :**

راناوە کەسی‌یە لکاوەکانی کۆمەڵەی $A$ لە رستەدا لەجێی راناوە کەسی‌یە جوێ‌یەکان بەبێ یاریدەی ئامرازی پەیوەندی دەبنە تەواوکەری بەرکاری ناڕاستەوخۆی فرمانی ئەمری تێنەپەڕی سادە لە شێوازی ئەرێ و نەرێ‌داو بەکەر دەلکێنرێن بەدوای ووشە تەواوکراوەکەوە ، وەك :

لەگەڵ پشیلەکە

| مان | ت | تان | ی | یان |

بمیاوێنن ( مەمیاوێنن ) .

ب ـ فرمانی ئەمری تێنەپەڕی ناسادە ( داڕێژاو ) :

راناوە کەسی یەلکاوەکانی کۆمەڵەی $A$ لە رستەدا نەجێی راناوە کەسی یە جوێیەکان بەبێ یاریدەی ئامرازی پەیوەندی دەبنە تەواوکەری بەرکاری ناراستەوخۆی فرمانی ئەمری تێنەپەڕی ناسادە ( داڕێژاو ) لە شێوازی ئەرێ و نەرێداو بەکەر بەدوای ووشە تەواوکراوەکەوە دێن . وەك :

| | | |
|---|---|---|
| لەسەر کانییەکە | م<br>مان<br>ت<br>تان<br>ی<br>یان | تۆزێ ڕابوەستە (ڕامەوەستە) . |

ج ـ فرمانی ئەمری تێنەپەڕی ناسادە ( لێکدراو ) :

راناوە کەسی یەلکاوەکانی کۆمەڵەی $A$ لە رستەدا لەبری راناوە کەسی یە جوێیەکان بەبێ یاریدەی ئامرازی پەیوەندی دەبنە تەواوکەری بەرکاری ناڕاستەوخۆی فرمانی ئەمری تێنەپەڕی ناسادە ( لێکدراو ) لە شێوازی ئەرێ و نەرێداو بەکەر دەلکێنرێن بەدوای ووشە تەواوکراوەکەوە ، وەك :

| | | |
|---|---|---|
| لە پەرێزەکە | م<br>مان<br>ت<br>تان<br>ی<br>یان | نزیك بکەوەرەوە (مەکەوەرەوە) |

# پوختـــەی بەشی دووەم
## یاســـا گشتی‌یەکانی
## ڕاناوە کەسی‌یە لکاوەکانی ك A

ڕاناوە کەسی‌یە لکاوەکانی ك A لە ڕستەدا :

(١) دەبنـــە بکەری هەموو دەمەکانی فرمانی ڕابوردووی تێپەڕی کارادیاری سادەو ناسادەی ئیخباری‌و ئینشائی لە شێوازی ئەرێ‌و نەرێدا و دەکەوونە بەشی گوزارەی ڕستەوە ، وەك :

| | |
|---|---|
| خواردم ــ نەم خوارد . | ( م ) |
| سوارەکەت بۆچی بانگ‌کرد ؟ | ( ت ) |

(٢) دەبنە بەرکاری ڕاســـتەوخۆی هەمـــوو دەمەکانی فرمانی ڕابوردوو و ڕانەبوردوو و ئەمری تێپەڕی سادەو ناسادەی ئیخباری‌و ئینشائی لە شـــێوازی ئەرێ‌و نەرێدا و هەمیشـــە دەکەوونە بەشی دەکەوونە بەشی گوزارەی ڕستەوە ، وەك :

| ڕســـتە | بەشی نیهاد | بەشی گوزارە | |
|---|---|---|---|
| ئەو ناردمی . | ئـەو | ناردمی | ( م ) |
| ئێمە نای‌ڕێژین . | ئێمە | نای‌ڕێژین | ( ی ) |
| ئێوە هەڵمانبسێنن . | ئێوە | هەڵمانبسێنن | (مان ) |

(٣) : دەبنە بەرکاری ناراســـتەوخۆی هەموو دەمەکانی فرمانی ڕابوردوو و ڕانەبوردووی کارادیار وکاراناديارى ســـادەو ناســـادەی ئیخباری‌و ئینشائی لە شێوازی ئەرێ‌و نەرێدا ، هەروەها فرمانی ئەمری تێپەڕو تێنەپەڕی سادەو ناسادە لە شێوازی ئەرێ‌و نەرێداو هەمیشـە دەکەوونە بەشی گوزارەی ڕستەوە ، وەك :

| رستە | بەشی نیهاد | بەشی گوزارە | |
|---|---|---|---|
| دارا هەنارەکەی لەگەڵم هەڵپرواند . | دارا | هەنارەکەی لەگەڵم هەڵپرواند | ( م ) |
| سەگەکە پێت وەڕی | سەگەکە | پێت وەڕی | ( ت ) |
| کارەکەی پێ ڕاپەڕێنرا . | کارەکە | ی ـ پێ ڕاپەڕێنرا | ( ی ) |
| ئێمە پارەکەتان بۆ دەنێرین . | ئێمە | پارەکەتان بۆ دەنێرین | ( تان ) |
| شوانەکە لەگەڵم دادەنیشێت . | شوانەکە | لەگەڵم دادەنیشێت | ( م ) |
| پارەکەیان پێ دەخرێت . | پارەکە | یان پێ دەخرێت | ( یان ) |
| تۆ کەوەکەم بۆ بنێرە . | تۆ | کەوەکەم بۆ بنێرە | ( م ) |
| ئێوە لەگەڵیان هەڵتوتێن . | ئێوە | لەگەڵیان هەڵتوتێن | ( یان ) |

(٤) دەبنە تەواوکـــەر :

أ ـ تەواوکەری کارا ، وەك :

کچەکەت گولەکەی هەڵوەراند . ( کچەکە ـ ت )

کەلەکەم بەشـــا . ( کەلەکە ـ م )

پشیلەکەی گۆشتەکە دەخوات . ( پشیلەکە ـ ی )

جوتیارەکەتان ڕەنج دەدات . ( جوتیارەکە ـ تان )

ب ـ دەبنە تەواوکەری جێگری کارا ، وەك :

جوانووەکەیان فرۆشرا . ( جوانووەکـە ـ یان )

قەرسیلەکەمان دەخورێت . ( قەرسیلەکە ـ مان )

ج ـ دەبنە تەواوکەری بەرکاری ڕاستەوخۆ :

ئەو کەوەکەمی هێنا . ( کەوەکـــە ـ م )

پشتێنەکەت دەبەستێت . ( پشتێنەکە ـ ت )

خەرمانەکەی هەڵبگرن . ( خەرمانەکە ـ ی )

د ـ دەبنە تەواوکەری بەرکاری ناڕاستەوخۆ ، وەك :

چاکەتەکەم بۆ کوڕەکەت بڕی . ( بۆ کوڕەکە ـ ت )

لەگەڵ باوکم نەهاتم . ( لەگەڵ باوك ـ م )

گەنمەکە بە دەستاڕەکەی هاڕدرابوو . ( بە دەستاڕەکە ـ ی )

چەقۆکە بە بڕبەندەکەتان تیژدەکەم . ( بە بڕبەندەکە ـ تان )

بەرەکە لەسەر سەکۆکەیان ڕادەخرێت . ( لەسەر سەکۆکەـیان )

گولەکە بە دەستمەوە هەڵدەوەرێت . (بە دەست ـ م ـ ەوە)

دیوارەکە بە پاچەکەت هەڵبوەشێنە . ( بە پاچەکـــە ـ ت )

لەسەر پەرێزەکەمان ڕامەوەستە . (لەسەر پەرێزەکە ـ مان)

هـ ـ دەبنە بەستەر لە نێوان کاراو گوزارەی ناتەواو ، وەك :

من برســـیمە . ( م )

ئێمـە برسـیمانە . ( مان )

تـۆ برســـیتە . ( ت )

ئێـوە برسیتانە . ( تان )

ئـەو برســـیەتی . ( ی )

ئەوان برســـیانە ( یان )

# بەشی سێیەم

## ٢ ـ راناوە کەسیبە لکاوەکانی کۆمەڵەی B

لەسەرەتاوە راناوە کەسیبە لکاوەکانمان کرد بە دوو بەشەوە :

١ ـ کۆمەڵەی A .

٢ ـ کۆمەڵەی B .

لە شوێنی خۆیدا لە سیفەتەکانو ئەرکەکانو مەڵبەندەکانی کۆمەڵەی $A$ دوایینو بە وێنە پیشانمان دان .

ئەوا لێرەشدا لە کۆمەڵەی $B$ دەدوێینو لە سیفەتەکانو ئەرکەکانو مەڵبەندەکانی ئەم کۆمەڵەیەش دەدوێینو بە وێنە پیشانیان دەدەین ، بەلام بەر لەوەی بچینە سەر بڕبڕەی پشتی باسەکە ، دەمەوێ هەندێ لێبینی گرنگ هەیە دەربارەی ئەم کۆمەڵەیە ( کۆمەڵەی $B$ ) بیخەمە بەرچاوتان .. ئەنجا بۆ ئەمە باپێکەوە سەرنج بدەینە لاپەڕە ( ٨ )ی ئەم باسە .. دەبینین :

راناوە کەسیبە لکاوەکانی کۆمەڵەی $B$ ..

یەکەم : لەم راناوە کەسیبە لکاوانە پێکهاتوون : ـ

١ ـ راناوی ( م ) لەبری راناوی ( من )ی جوێ بۆ کەسی یەکەمی تاکو راناوی ( ین ) لەبری راناوی ( ئێمە )ی جوێ بۆ کەسی یەکەمی کۆ بەکار دەهێنرێن .

ب ـ راناوی ( یت ـ ی ـ ت ) و ( ە ـ . . . ) لەبری راناوی ( تۆ )ی جۆ بۆ کەسی دووەمی تاکو راناوی ( ن ) لەبری راناوی ( ئێوە )ی جۆ بۆ کەسی دووەمی کۆ بەکاردەهێنرێن .

ج ـ راناوی ( ێت ـ ێ ـ ت ) و راناوی ( ات ـ ا ) و ( . . . ) لەبری راناوی ( ئەو )ی جـــۆ بۆ کەسی سێیەمی تاکو راناوی ( ن لەبری راناوی ( ئەوان )ی جـــۆ بۆ کەسی سێیەمی کـــۆ بەکاردەهێنرێن .

دووەم ـ وەك تێبینی دەکـــەین ، رانـــاوە کەسی‌یە لکاوەکانی کۆمەڵەی $B$ لەچاو راناوە کەسی‌یە لکاوەکانی کۆمەڵەی $A$ « هەست بە ئاڵۆزی‌یێك دەکەین لە دارشتنیاندا ، وەك لەم نەخشەیەی خوارەوەدا بەرچاو دەکەوێت » :

## رانـــاوە لکاوەکانی کۆمەڵـــەی

| | A | B |
|---|---|---|
| کەسی یەکەمی تاك | م | م |
| کەسی یەکەمی کـۆ | مان | ین |
| کەسی دووەمی تاك | ت | ( یت ـ ی ـ ت ) و ( ە ـ . . . ) |
| کەسی دووەمی کۆ | تان | ن |
| کەسی سێیەمی تاك | ی | (ێت ـ ێ ـ ت) و (ات ـ ا) و (. . .) |
| کەسی سێیەمی کۆ | یان | ن |

سێیەم ـ راناوی لکاوی ( یت ) کە بۆ کەسی دووەمی تاك بەکار دەهێنرێت ، دەبینین :

ـ هەندێ جار بە ئارەزوو پیتی ( ت )ی لێ فڕێ دەدرێت ، وەك :

**تۆ هاتیت ( یت ) ـ هاتی ( ی )**

**تۆ نووستیت ( یت ) ـ نووستی ( ی )**

راناوی ( یت ) ناتوانرێت کورت بکرێتەوەو بکرێت بە ( ی ) ئەگەر :

١ ـ بەرکاری ناراستەوخۆی خرابەسەر بەیاریدەی ئامرازی پەیوەندی ( ە )وە ، وەك :

تۆ هاتیت ـ تۆ هاتیتە ناو باخەکەوە .

**( هات ـ یت ـ ە ناو باخەکەوە ) .**

تۆ گەیشتیت ـ تۆ گەیشتیتەجێ .

**( گەییشت ـ یت ـ ە جێ ) .**

٢ ـ پاشگری ( ەوە )ی خرابەسەر ، وەك :

تۆ وانەکەت دەنووسیتەوە .

**( دە ـ نووس ـ یت ـ ەوە )**

تۆ زەوییەکەت دەکێڵیتەوە .

**( دە ـ کێڵ ـ یت ـ ەوە )**

ب ـ ئەگەر فرمانە رابوردووەکە کۆتایی بە پیتی ( ی ) هاتبوو واتە لە چاووگی پاییـــــەوە هاتبوو ، لـەبری ( یت ) رانـاوی ( ت ) بەکاردەهێنرێت ، وەك :

**تۆ فڕیت . ( فڕی ـ ت )**

**تۆ وەریت . ( وەری ـ ت )**

ج ـ راناوی ( ە ) تەنیا بۆ ڕێژەی ئەمر لە شـــێوازی کەسی دووەمی تاکدا بەکاردەهێنرێت ، وەك :

**دانیشـــە ( ە )**

**دابــەزە ( ە )**

**بچێنـــە ( ە )**

بەلام لەو فرمانانەدا ، کە رەگەکانیان کۆتایی بە یەکێ لەم پیتــە بزوێنانە دێت ( ە ، ۆ ، وو ، ێ ، ی ) ، راناوی ( ە ) دەرناکەوێت ، وەك :

دەکـــەم ( م ) ـ بـکە ( ... ) چونکە ڕەگ ( کە ) بە .

دەڕۆم ( م ) ـ بـڕۆ ( ... ) چونکە ڕەگ ( ڕۆ ) بە .

دەنـووم ( م ) ـ بنـوو ( ... ) چونکە ڕەگ ( نوو ) ە .

دەسووتێم ( م ) ـ بسـووتێ ( ... ) چونکە ڕەگ ( سووتێ ) بە .

دەگـریم ( م ) ـ بگـری ( ... ) چونکە ڕەگ ( گری ) ە .

چوارەم ـ راناوی ( ێت ) ، کـــە بۆ کەسی سێیەمی تاك لەبری. راناوی ( ئەو ) بەکاردەهێنرێت ، وەك :

**ئەو دەبیستێت . ( ێت ) .**

**ئەو دادەنیشێت . ( ێت ) .**

ئــەم راناوە :

ـ هەندێ جار بە ئارەزوو لـــە فرمانی رانەبوردوودا پیتی ( ت )ی لێ فڕێ دەدرێتو تەنیا ( ێ ) بەکاردەهێنرێت ، وەك :

ـــ ئەو وانەکەی دەخوێنێ . **( دە ـ خوێن ـ ێ )**

ـــ ئەو دەچێ بـۆ سـەیران . **( دە ـ چ ـ ێ )**

**بەلام ئەگـەر فرمانەکە :**

١ ــ بەرکاری ناراستەوخۆی بەیاریدەی ئامرازی پەیوەندی ( ە ) وە ، خرابەسەر . ئەو دەمە دەبێت بە ناچاری راناوی ( ێت ) بەکاربهێنرێت ، وەك :

ــ ئامال دەچێتە بازار .   **( دە ــ چ ــ ێت ــ ەبازار )**

کەوەکە دەفڕێتە سەردارەکە .   **(دە ــ فڕ ــ ێت ــ ەسەردارەکە)**

٢ ــ ئەگەر پاشگری ( ەوە )ی خرابەسەر دێسان دەبێت بە ناچاری راناوی ( ێت ) بەکاربهێنن ، وەك :

ــ ئەو هۆنراوە دەهۆنێتەوە .

**( دە ــ هۆن ــ ێت ــ ەوە )**

ــ ئەو دڕکەزی دەبڕێتەوە .

**( دە ــ بڕ ــ ێت ــ ەوە )**

ب ــ بەڵام فرمانەکە ئەگەر خۆی کۆتایی بە پیتەبزوێنی ( ێ ) هاتبوو ، ناتوانین ( ێت ) بەکاربهێنین ، دەبێت تەنیا راناوی ( ت ) بەکاربهێنین ، وەك :

**دەنووسرێ + ت = دەنووسرێت .**

**دەفرۆشرێ + ت = دەفرۆشرێت .**

**دەخوسێنرێ + ت = دەخوسێنرێت .**

پێنجەم ــ راناوی « ات » یان ( ا ) ، کە بۆ کەسی سێیەمی تاك لەبری راناوی ( ئەو ) لە فرمانی رانەبوردووی کارادیاردا بەکاردەهێنرێت ، وەك :

**دەبات ( دەب ــ ات )**

**دەخوات ( دە ــ خو ــ ات )**

ئەم راناوە :

١ ــ بەبیروورای من هەر راناوی ( ێت )ەو بیتی ( ێ ) بەکەمی تێدا گۆڕدراوە بە ( ا ) لەو فرمانە رانەبوردووانەی کە ڕەگەکانیــان بە بێتی ( ە ) یا ( ۆ ) کۆتایی هاتووە ، وەك :

| چاووك | رابوردوو | رەگ | رانەبوردوو لەگەڵ ڕاناوی ( ات )دا |
|---|---|---|---|
| بــردن | بــرد | بــە | دەبات ( دە ــ ب ــ ات ) |
| خــستن | خــست | خە | دەخات ( دە ــ خ ــ ات ) |
| کردن | کرد | کە | دەکات ( دە ــ ك ــ ات ) |
| خواردن | خوارد | خو | دەخوات ( دە ــ خو ــ ات ) |
| دان | دا | دە | دەدات ( دە ــ د ــ ات ) |
| شوشتن | شوشت | شۆ | دەشوات ( دە ــ شو ــ ات ) |
| گەیشتن | گەیشت | گە | دەگات ( دە ــ گ ــ ات ) |

تێبینی :

ئەو فرمانە رانەبوردووانەی کە ڕەگەکانیان کۆتایی بە پیتەبزوێنی (ە) دێت ، کە راناوی ( ات )ی دەخرێتەسەر ، پیتە بزوێنەکە هەڵدەگیرێ ، وەك لەلای سەرەوە ڕوونکراوەتەوە ، واتە :

ــ ڕەگی ( بە ) دەبێت بە ( ب ) ، تەنیا لە کەسی سێیەمی تاکدا .

ــ ڕەگی ( خە ) دەبیت بە ( خ ) ، تەنیا لە کەسی سێیەمی تاکدا .

ــ ڕەگی ( کە ) دەبێت بە ( ك ) ، تەنیا لە کەسی سێیەمی تاکدا .

ــ ڕەگی ( دە ) دەبێت بە ( د ) ، تەنیا لە کەسی سێیەمی تاکـدا .

چونکە دوو پیتەبزوێن لە شوێنێکدا بە دوای یەکتردا نایەن ، لەبەر ئەوەیە ناتوانین :

ــ لەبری (دەبات) بڵێین : (دەبەات)

ــ لەبری (دەخات) بڵێین : (دەخەات)

ــ لەبری : دەگات) بڵێین : (دەگەات)

٢ ــ بە ئارەزووە ، واتە دەتوانرێت (ات)و دەتوانرێت (ا) بەکار بهێنرێت ، وەك :

دەبات ــ دەبا

دەگات ــ دەگا

دەخوات ــ دەخوا

دەخات ــ دەخا

٣ ــ بە ناچاری‌یە ، واتە ئەگەر بەرکاری ناراستەوخۆ بەیاریدەی ئامرازی پەیوەندی (ە) وە خرایەسەر فرمانەکە ناتوانین راناوی (ا) بەکاربهێنین ، دەبێت راناوی (ات) بەکاربهێنین ، وەك :

ــ باوکم بەیانی دەگاتەجێ .

**( دە ــ گ ــ ات ــ ەجێ )**

ــ جوتیارەکە گەنمەکە دەکاتەجەوالەکەوە .

**( دە ــ ك ــ ات ــ ەجەوالەکەوە )**

ــ سوارەکە زینەکە دەخاتەسەر ئەسپەکە .

**( دە ــ خ ــ ات ــ ەسەرئەسپەکە ) .**

٤ ــ ئەگەر پاشگری (ەوە) یان خرایەسەر ، بەکارهێنانی راناوی (ات) ناچاری‌یە ، وەك :

دەڕوا ــ دەڕواتەوە ( دە ــ ڕو ــ ات ــ ەوە )

دەخا ــ دەخاتەوە ( دە ــ خ ــ ات ــ ەوە )

دەبا ــ دەباتەوە ( دە ــ ب ــ ات ــ ەوە )

شەشەم ــ ئەگەر لە بەکارهێنانی راناوی ( ن )ی کەسی دووەمی کۆو کەسی سێیەمی کۆ گومان هەبوو ، بۆ نەهێشتنی ئەو گــومانە راناوی کەسی جوێ بۆ یەکەمیان ( ئێوە )و بۆ دووەمیـــان ( ئەوان بەکاردەهێنین ، بۆ وێنە :

ئەگــــەر گوتمان :

**لە راڕەوەکەدا دەنوون .**

رەنگە لە ناوەرۆکی ئەم رستەیە بکەوێنــــە گومانەوەو نەزانین ، مەبەست لە ( ئەوان ) ، یان ( ئێوە ) لە راڕەوەکەدا دەنوون ، ئەنجــا ئەگەر مەبەستمان ( ئێوە ) بوو ، دەڵێین :

**ئێوە لــــە راڕەوەکەدا نووستن .**

خۆ ئەگەر مەبەستمان ( ئەوان ) بوو ، ئەوا دەڵێین :

**ئەوان لــــە راڕەوەکەدا نووستن .**

حەوتەم ــ راناوی دیارو راناوی نادیار :

راناوە لکاوەکانی کۆمەڵەی $B$ لە هەموو دەمەکاندا لە بەکارهێناندا دەردەکەوون ، لە دوو مەڵبەندد١ نەبێت :

ــ لە هەموو دەمەکانی فرمانی رابوردووی تێنەپەڕی کارادیاردا ، وەك :

| | | |
|---|---|---|
| ئـــەو | خلیســـکا | ( ... ) |
| | خلیسکاوە | ( ... ) |
| | دەخلیســـکا | ( ... ) |
| | خلیسکابوو | ( ... ) |
| | بخلیسکایە | ( ... ) |
| | خلیسکابوایە | ( ... ) |
| | خلیسکابێت | ( ... ) |

ب ـ لە هەموو دەمەکانی فرمانی رابوردووی کاراناديارد ا ، وەك :

| | | |
|---|---|---|
| دەنگەکـە | بیـرا | ( ... ) |
| | بیـراوە | ( ... ) |
| | دەبیـرا | ( ... ) |
| | بیـرابوو | ( ... ) |
| | ببیـرایە | ( ... ) |
| | بیـرابوایە | ( ... ) |

هەشتەم ـ راناوە کەسىيە لکاوەکانی کۆمەڵەی $B$ لە ئاخاوتندا ئەم ئەرکانە ، دەبینن :

**١ ـ ئەرکی بکەر**

**٢ ـ ئەرکی بەرکاری راستەوخۆ**

**٣ ـ ئەرکی بەرکاری ناراستەوخۆ**

**٤ ـ ئەرکی تەواوکەری بەرکاری ڕاستەوخۆ**

# ئەركی راناوە كەسی‌یە لكاوەكانی كۆمەڵەی B

## ١ ــ بكەر

راناوە كەسی‌یە لكاوەكانی كۆمەڵەی *B* لە رستەدا لەبری راناوە كەسی‌یە جوێیەكان دەبنە :

١ ــ بكەری هەموو دەمەكانی فرمانی رابوردووی تێنەپەڕی كارا دیاری سادەو(١) ناسادەی ئیخباری‌و ئینشائی لە شێوازی ئەرێ‌و نەرێ‌داو هەمیشە دەكەونە دوای **قەدی** فرمانەكەوە لە بەشی گوزارەدا :

**ا ــ وێنە بۆ شێوازی ئیخباری :**

| | |
|---|---|
| من چووم . | ( چوو(٢) ــ م ) |
| ئێمە چووین . | ( چوو ــ ین ) |
| تۆ چوویت . | ( چوو ــ یت ) |
| ئێوە چوون . | ( چوو ــ ن ) |
| ئەو چوو . | ( چوو ــ ...(٣) ) |
| ئەوان چوون . | ( چوو ــ ن ) |

---

(١) لە وێنەكاندا یان سادە ، یان ناسادە پیشاندەدەم .

(٢) ( چوو ) : قەدی فرمانەكەیە لە ( چوون )ی چاووگەوە وەرگیراوە .

(٣) لە كەسی سێیەمدا راناوی لكاو دەرناكەوێت .

ب ـ وێنە بۆ شێوازی ئینشائی :

| | |
|---|---|
| من بخەوتمایە . | ( بـ ـ خەوت ـ م ـ ایە ) |
| ئێمە بخەوتینایە . | ( ب ـ خەوت ـ ین ـ ایە ) |
| تۆ بخەوتیتایە . | ( ب ـ خەوت ـ یت ـ ایە ) |
| ئێوە بخەوتنایە . | ( ب ـ خەوت ـ ن ـ ایە ) |
| ئەو بخەوتایە(٤) . | ( ب ـ خەوت ـ . . . ـ ایە ) |
| ئەوان بخەوتنایە . | ( ب ـ خەوت ـ ن ـ ایە ) |

٢ ـ بکەری فرمانی رانەبوردووی تێنەپەڕی کارادیاری سادەو ناسادەی ئیخباریو ئینشائی لە شێوازی ئەرێو نەرێداو ، هەمیشە دەکەونە دوای ڕەگی فرمانەکەوە لە بەشی گوزارەدا :

ا ـ وێنە بۆ شێوازی ئیخباری :

| | |
|---|---|
| من دەگلێم . | ( دە ـ گلێ ـ م ) |
| ئێمە دەگلێین . | ( دە ـ گلێ ـ ین ) |
| تۆ دەگلێیت . | ( دە ـ گلێ ـ یت ) |
| ئێوە دەگلێن . | ( دە ـ گلێ ـ ن ) |
| ئەو دەگلێت . | ( دە ـ گلێ ـ ت ) |
| ئەوان دەگلێن . | ( دە ـ گلێ ـ ن ) |

ب ـ وێنە بۆ شێوازی ئینشائی :

| | |
|---|---|
| من ڕێبکەوم . | ( بـ ـ کەو ـ م ) |
| ئێمە ڕێبکەوین . | ( بـ ـ کەو ـ ین ) |
| تۆ ڕێبکەویت . | ( بـ ـ کەو ـ یت ) |
| ئێوە ڕێبکەون . | ( بـ ـ کەو ـ ن ) |
| ئەو ڕێبکەوێت . | ( بـ ـ کەو ـ ێت ) |
| ئەوان ڕێبکەون (٥) | ( بـ ـ کەو ـ ن ) |

---

(٤) ڕاناوی کەسی سێیەمی تاک دەرناکەوێت .

٣ ـ دەبنە بکەری فرمانی ئەمری تێپەڕی سادەو ناسادەی کەسی دووەمی تاكو كۆ لە شێوازی ئەرێو نەرێداو هەمیشە **بەدوای ڕەگی** فرمانەکەدا دێن :

**ا ـ وێنە بۆ شێوازی ئەرێ :**

مەڕەکان بدۆشە . ( ب ـ دۆش ـ ە )

پووزەوانەکان بچنن . ( ب ـ چن ـ ن )

**ب ـ وێنە بۆ شێوازی نەرێ :**

شۆرباکە هەڵمەقوڕێنە . ( هەڵقوڕێن ـ ە )

ئاوەکە مەشڵەقێنن . ( شڵەقێن ـ ن )

٤ ـ دەبنە بکەری فرمانی ئەمری تێنەپەڕی سادەو ناسادەی کەسی دووەمی تاكو كۆ لە شێوازی ئەرێو نەرێداو هەمیشە بە **دوای ڕەگی** فرمانەکەدا دێن :

**ا ـ وێنە بۆ شێوازی ئەرێ :**

**تۆ بشەلە . ( ب ـ شەل ـ ە )**

**ئێوە بپژمن . ( ب ـ پژم ـ ن )**

**ب ـ وێنە بۆ شێوازی نەرێ :**

**تۆ پێمەکەنە . ( پێکەن ـ ە )**

**ئێوە مەخەون . ( خەو ـ ن )**

## ٢ ــ جێگــری بکەر

راناوە کەسی‌یە لکاوەکانی کۆمەڵەی $B$ لە رستەدا لەجێی راناوە کەسی‌یە جوێیەکان دەبنە :

١ ــ جێگری بکەری هەموو دەمەکانی فرمانی رابوردووی کراناڵدیاری سادەو ناسادەی ئیخباری‌و ئینشــــــائی لە شێوازی ئەرێ‌و نەرێداو ، هەمیشە دەکەوونە دوای قەدی فرمانەکەوە لە بەشی گوزارەدا :

ا ــ وێنە بۆ شێوازی ئیخباری :

| | |
|---|---|
| من ئەنگاوترام . | ( ئەنگاوترا[١] ــ م ) |
| ئێمە ئەنگاوتراین . | ( ئەنگاوترا ــ ین ) |
| تۆ ئەنگاوترایت . | ( ئەنگاوترا ــ یت ) |
| ئێوە ئەنگاوتران . | ( ئەنگاوترا ــ ن ) |
| ئەو ئەنگاوترا . | ( ئەنگاوترا ــ ن ) |
| ئەوان ئەنگاوتران . | ( ئەنگاوترا . . . ) |

ب ــ وێنە بۆ شێوازی ئینشائی :

| | |
|---|---|
| خۆزگە من هێنرابوومایە . | ( هێن ــ را ــ بوو ــ م ــ ایە ) |
| خۆزگە ئێوە هێنرابوونایە . | ( هێن ــ را ــ بوو ــ ن ــ ایە ) |
| خۆزگە تۆ هێنرابوویتایە . | ( هێن ــ را ــ بوو ــ یت ــ ایە ) |
| خۆزگە ئێوە هێنرابوونایە . | ( هێن ــ را ــ بوو ــ ن ــ ایە ) |
| خۆزگە ئەو هێنرابووایە . | ( هێن ــ را ــ بوو ــ . . . ایە ) |
| خۆزگە ئەوان هێنرابوونایە . | ( هێن ــ را ــ بوو ــ ن ــ ایە ) |

---

(١) لە رووی راستی‌یەوە :
ــــ ئەنگاوت : قــەدە .
ــــ را : نیشانەی کاراناڵدیارە .

٢ ـ جێگری بکەری فرمانی رانەبوردووی کاراناديارى ســـادەو ناسادەی ئیخباری‌و ئینشائی لە شێوازی ئەرێ‌و نەرێ‌داو . هەمیشــە دەکەوونە دوای رەگی فرمانەوە لە بەشی گوزارەدا :

### ا ـ وینە بۆ شێوازی ئیخباری :

| | |
|---|---|
| من دەخەوێنرێم(١) . | ( دە ـ خەوێن ـ رێ ـ م ) |
| ئێمە دەخەوێنرێین . | ( دە ـ خەوێن ـ رێ ـ ین ) |
| تۆ دەخەوێنرێیت . | ( دە ـ خەوێن ـ رێ ـ یت ) |
| ئێوە دەخەوێنرێن . | ( دە ـ خەوێن ـ رێ ـ ن ) |
| ئەو دەخەوێنرێت . | ( دە ـ خەوێن ـ رێ ـ ت ) |
| ئەوان دەخەوێنرێن . | ( دە ـ خەوێن ـ رێ ـ ن ) |

### ب ـ وینە بۆ شێوازی ئینشائی :

| | |
|---|---|
| من هەڵبلوشرێم(٢) . | ( هەڵ ـ بـ ـ لوش ـ رێ ـ م ) |
| ئێمە هەڵبلوشرێین . | ( هەڵ ـ بـ ـ لوش ـ رێ ـ ین ) |
| تۆ هەڵبلوشرێیت . | ( هەڵ ـ بـ ـ لوش ـ رێ ـ یت ) |
| ئێوە هەڵبلوشرێن . | ( هەڵ ـ بـ ـ لوش ـ رێ ـ ن ) |
| ئەو هەڵبلوشرێت . | ( هەڵ ـ بـ ـ لوش ـ رێ ـ ن ) |
| ئەوان هەڵبلوشرێن . | ( هەڵ ـ بـ ـ لوش ـ رێ ـ ت ) |

---

(١) لە شێوازی نەرێدا دەگۆرێت ( من ناخەوێنرێم ) .

(٢) لە شێوازی نەرێدا دەگۆرێت ( من هەڵنەلو شرێم ) .

## ٣ ـ بەرکاری ڕاستەوخۆ

ڕاناوە کەسییە لکاوەکانی کۆمەڵەی *B* لە ڕستەدا ، لەجێی ڕاناوە کەسییە جوێیەکان دەبنە بەرکاری ڕاستەوخۆی هەموو دەمەکانی فرمانی ڕابوردووی تێپەڕی کارادیاری سادەو ناسادەی ئیخباریو ئینشائی لە شێوازی ئەرێو نەرێدا .

## ( ١ )

## فرمانی ڕابوردووی تێپەڕی کارادیاری سادە

ڕاناوە کەسییە لکاوەکانی کۆمەڵەی *B* لە ڕستەدا ، لەجێی ڕاناوە کەسییە جوێیەکان دەبنە بەرکاری ڕاستەوخۆی هەموو دەمەکانی فرمانی ڕابوردووی تێپەڕی کارادیاری سادە ، بەڵام :

١ ـ لە ڕابوردووی ڕەبەقو تەواو ، دووری سادەدا ، لە شێوازی ئەرێدا ڕاناوەکانی بەرکاری ڕاستەوخۆ ( لە *B* ) بەدوای ڕاناوەکانی بکەردا ( لە *A* ) دێنو ووشەکانی ڕستەکە وەها دەڕیزێن :

ـــ قەدی فرمان

ـــ ڕاناوی بکەر ( لە A )

ـــ ڕاناوی بەرکاری ڕاستەوخۆ ( لە B ) .

ا ـ وێنە بۆ رابوردووی سادەی رەبەق لە شێوازی ئەرێدا :

| رسته | قەدی فرمان | بکەر ( ك A ) | بەرکاری راستەوخۆ ( ك B ) |
|---|---|---|---|
| ناردمیت | نارد | م | یت |
| ناردمانن | نارد | مان | ن |
| ناردتم | نارد | ت | م |
| ناردتانین | نارد | تان | ین |

بەلام لە کەسی سێیەمی تاکو کۆدا ، راناوی بکەر ( ك *A* ) ، دوای راناوی بەرکاری راستەوخۆ ( ك *B* ) دەکەوێت ، وەك :

ناردمی ( نارد ـ م ـ ی )

ناردتیان ( نارد ـ ت ـ یان )

ب ـ وێنە بۆ رابوردووی سادەی تەواو لە شێوازی ئەرێدا :

| رسته | قەدی فرمان | بکەر ( ك A ) | بەرکاری راستەوخۆ ( ك B ) |
|---|---|---|---|
| ناردووتم | ناردوو | ت | م |
| ناردووتن | ناردوو | ت | ن |
| ناردووتانین | ناردوو | تان | ین |
| ناردوومیت | ناردوو | م | یت |
| ناردوومانن | ناردوو | مان | ن |

بەڵام لە کەسی سێیەمی تاکو کـــۆدا ڕاناوی بکەر دوای ڕاناوی بەرکاری ڕاستەوخۆ دەکەوێتو ڕاناوی بکەرو بەرکار لە ك A دەبن ، وەك

ناردوومی ( ناردوو ـ م ـ ی )

ناردووتیان ( ناردوو ـ ت ـ یان )

**ج ـ وێنە بۆ ڕابوردووی سادەی دوور لە شێوازی نەرێدا :**

| ڕستە | قەدی فرمان | بکەر ( ك A ) | بەرکاری ڕاستەوخۆ ( ك B ) |
|---|---|---|---|
| شێلابوومیت | شێلابوو | م | یت |
| شێلابوومانن | شێلابوو | مان | ن |
| شێلابووتم | شێلابوو | ت | م |
| شێلابووتانین | شێلابوو | تان | ین |

بەڵام لە کەسی سێیەمی تاکو کۆدا ، ڕاناوی بکەر ، دوای ڕاناوی بەرکاری ڕاســـتەوخۆ دەکەوێت و ڕاناوی بکەرو بەرکار لـــە ك A دەبن ، وەك :

شێلابوومی ( شێلابوو ـ م ـ ی )

شێلابووتیان ( شێلابوو ـ ت ـ یان )

٢ ـ لە ڕابوردووی ڕەبەقو تەواوو دووری سادە ، لـــە شێوازی نەرێدا ، ڕاناوەکانی بەرکاری ڕاستەوخۆ بەدوای قـــەدی فرماندا دێنو ووشەکانی ڕستەکە وەها دەڕیزێن :

- ئامرازی نەفی
- ڕاناوی بکەر ( ك A )
- قەدی فرمان
- ڕاناوی بەرکاری ڕاستەوخۆ ( ك B )

ا ـ وێنە بۆ ڕابوردووی سادەی ڕەبەق لە شێوازی نەرێدا :

| ڕستە | ئامرازی نەفی | ڕاناوی بکەر (لە A) | قەدی فەرمان | ڕاناوی بەرکاری ڕاستەوخۆ (لە B) |
|---|---|---|---|---|
| نەمناردبیت | نە | م | نارد | بیت |
| نەمانناردن | نە | مان | نارد | ن |
| نەتناردم | نە | ت | نارد | م |
| نەتانناردین | نە | تان | نارد | ین |
| نەیناردن | نە | ی | نارد | ن |
| نەیانناردبیت | نە | یان | نارد | بیت |

ب ـ وێنە بۆ ڕابوردووی سادەی تەواو لە شێوازی نەرێدا :

| ڕستە | ئامرازی نەفی | ڕاناوی بکەر (لە A) | قەدی فەرمان | ڕاناوی بەرکاری ڕاستەوخۆ (لە B) |
|---|---|---|---|---|
| نەتناردووم | نە | ت | ناردوو | م |
| نەتانناردووین | نە | تان | ناردوو | ین |
| نەمناردوون | نە | م | ناردوو | ن |
| نەمانناردوویت | نە | مان | ناردوو | یت |
| نەیناردووم | نە | ی | ناردوو | م |
| نەیانناردووین | نە | یان | ناردوو | ین |

ج ـ وێنە بۆ رابوردووی دووری سادە لە شێوازی نەرێدا :

| ڕستە | ئامرازی نەفی | راناوی بکەر ( لە A ) | قـەدی فرمان | راناوی بەرکاری راستەوخۆ ( لە B ) |
|---|---|---|---|---|
| نەمشێلابوویت | نە | م | شێلابوو | یت |
| نەمانشێلابوون | نە | مان | شێلابوو | ن |
| نەتشێلابووم | نە | ت | شێلابوو | م |
| نەتانشێلابووین | نە | تان | شێلابوو | ین |
| نەیشێلابووم | نە | ی | شێلابوو | م |
| نەیانشێلابوویت | نە | یان | شێلابوو | یت |

٣ ـ لـــە رابوردووی بەردەوامی ســـادەدا ، راناوەکانی بەرکاری راستەوخۆ لە شـــێوازی ئەرێ و نەرێدا بەدوای قـــەدی فرماندا دێن و وشـەکانی رستەکە وەها دەریزێن :

— نیشانەی ڕیژە ( دە )

— ئامرازی ( نە ) لە شێوازی نەرێدا

— راناوی بکەر ( لە A )

— قەدی فرمان

— راناوی بەرکاری ڕاستەوخۆ ( لە B )

ا ـ وێنە بۆ شێوازی ئەرێ :

| ڕستە | ڕێژە | ڕاناوی بکەر (ك B) | قەدی فرمان | ڕاناوی بەرکاری ڕاستەوخۆ (ك B) |
|---|---|---|---|---|
| دەمخزاندیت | دە | م | خزاند | یت |
| دەمانخزاندن | دە | مان | خزاند | ن |
| دەتخزاندم | دە | ت | خزاند | م |
| دەتانخزاندین | دە | تان | خزاند | ین |
| دەیخزاندیت | دە | ی | خزاند | یت |
| دەیانخزاندم | دە | یان | خزاند | م |

ب ـ وێنە بۆ شێوازی ئەرێ :

| ڕستە | ئامرازی نەفی | ڕاناوی بکەر (ك A) | ڕێژەو قەد | ڕاناوی بەرکاری ڕاستەوخۆ (ك B) |
|---|---|---|---|---|
| نەمدەخزاندیت | نە | م | دەـخزاند | یت |
| نەماندەخزاندن | نە | م | دەـخزاند | ن |
| نەتدەخزاندم | نە | ت | دەـخزاند | م |
| نەتاندەخزاندین | نە | تان | دەـخزاند | ین |
| نەیدەخزاندیت | نە | ی | دەـخزاند | یت |
| نەیاندەخزاندن | نە | یان | دەـخزاند | مان |

٤ ـ له رابوردووی ئینشائی ساده‌دا راناوه‌كانی به‌ركاری راسته‌وخۆ له شێوازی ئه‌رێ‌و نه‌رێدا به‌دوای فرماندا دێن‌و ووشه‌كانی رسته‌كه وه‌ها ده‌ریزێن :

— نیشانه‌ی ریژه ( ب )

— ئامرازی ( نه )ی نه‌فی له شێوازی نه‌رێدا

— راناوی بكه‌ر ( ك A )

— قه‌دی فرمان

— راناوی به‌ركاری راسته‌وخۆ ( ك B )

— ریژه‌ی كوتایی ( ایه ) .

ا ـ وێنه بۆ شێوازی ئه‌رێ :

| رسته | ریژه | راناوی بكه‌ر ( ك A ) | قه‌دی فرمان | به‌ركاری راسته‌وخۆ ( ك B ) | ریژه‌ی كوتایی |
|---|---|---|---|---|---|
| بم‌هاوردیتایه | بـ | م | هاورد | یت | ایه |
| بمان‌هاوردنایه | بـ | مان | هاورد | ن | ایه |
| بت‌هاوردمایه | بـ | ت | هاورد | م | ایه |
| بتان‌هاوردینایه | بـ | تان | هاورد | ین | آیه |
| بی‌هاوردیتایه | بـ | ی | هاورد | یت | ایه |
| بیان‌هاوردمایه | بـ | یان | هاورد | م | ایه |

ب ـ وێنه بۆ شێوازی نەرێ :

| ڕسته | ئامرازی نەفی | ڕاناوی بکەر ( ك A ) | قەدی فرمان | بەرکاری ڕاستەوخۆ ( ك B ) | ڕێژەی کۆتایی |
| --- | --- | --- | --- | --- | --- |
| نەمهاوردیتایه | نه | م | هاورد | یت | ایه |
| نەمانهاوردنایه | نه | مان | هاورد | ن | ایه |
| نەتهاوردمایه | نه | ت | هاورد | م | ایه |
| نەتانهاوردینایه | نه | تان | هاورد | ین | ایه |
| نەیهاوردیتایه | نه | ی | هاورد | یت | ایه |
| نەیانهاوردنایه | نه | یان | هاورد | ن | ایه |

( ٢ )

# فرمــانی ڕابوردووی

## تێپەڕی کارادیاری ناساده ( داڕژاو )

ڕاناوه کەسی‌یه لکاوەکانی کۆمەڵەی B له ڕستەدا ، لەجێی ڕاناوه کەسی‌یه جوێ‌یەکان دەبنه بەرکاری ڕاســــتەوخۆی هەموو دەمەکانی فرمانی ڕابوردووی تێپەڕی کارادیاری ناساده ( داڕژاو ) لــه شێوازی ئەرێ و نەرێدا ، وه هەمیشــه بەدوای قەدی فرمانەکەدا دێن و ووشـەکانی ڕستەکه وەها دەڕیزێن :

— پێشــــــگر
— ڕاناوی بکەر ( ك A )
— ئامرازی نەفی له شێوازی نەرێدا

— قەدی فرمان(١)

— ڕاناوی بەرکاری ڕاستەوخۆ ( لە B )

ئەوا وێنە بۆ هەموو دەمەکانی فرمانەکە لە شێوازی ئەرێ و نەرێدا دەهێنینەوە :

أ – وێنە بۆ ڕابوردووی تێپەڕی ناسادە ( داڕژاو )ی ڕەبەق :

— لە شێوازی ئەرێدا :

| ڕسته | پێشگر | ڕانــاوی بکەر ( لە A ) | قەدی فرمان | ڕاناوی بەرکاری ڕاستەوخۆ ( لە B ) |
|---|---|---|---|---|
| دام‌نابت | دا | م | نــا | بت |
| دامان‌نان | دا | مان | نــا | ن |
| دات‌نام | دا | ت | نــا | م |
| داتان‌نابن | دا | تان | نــا | بن |
| دای‌نابت | دا | یَ | نــا | بت |
| دایان‌نابن | دا | یان | نــا | بن |

---

(١) ڕێژەو قەد لە ڕابوردووی بەردەوام و ئینشائی‌دا .

— له شێوازی نەرێدا :

| ڕسته | پێشگر | ڕاناوی بکەر (ك A) | ئامرازی نەفی | قەدی فرمان | ڕاناوی بەرکاری ڕاستەوخۆ (ك B) |
|---|---|---|---|---|---|
| دامنەنابت | دا | م | نە | نـا | بت |
| دامانەنانن | دا | مان | نە | نـا | ن |
| داتنەنام | دا | ت | نە | نـا | م |
| داتاننەناین | دا | تان | نە | نـا | ین |
| دایەنابت | دا | ی | نە | نـا | بت |
| دایاننەنان | دا | یان | نە | نـا | ن |

ب ـ وێنە بۆ ڕابوردووی تێپەڕی ناسادە ( داڕژاو )ی تەواو :

— له شێوازی ئەرێدا :

| ڕسته | پێشگر | ڕاناوی بکەر (ك A) | قەدی فرمان | ڕاناوی بەرکاری ڕاستەوخۆ (ك B) |
|---|---|---|---|---|
| هەڵمگرتووبت | هەڵ | م | گرتوو | بت |
| هەڵمانگرتوون | هەڵ | مان | گرتوو | ن |
| هەڵتگرتووم | هەڵ | ت | گرتوو | م |
| هەڵتانگرتووین | هەڵ | تان | گرتوو | ین |
| هەڵیگرتووبت | هەڵ | ی | گرتوو | بت |
| هەڵیانگرتوون | هەڵ | یان | گرتوو | ن |

— لە شێوازی نەرێدا :

| ڕستە | پێشگر | ڕاناوی بکەر ( لکA ) | ئامرازی نەفی | قەدی فرمان | ڕاناوی بەرکاری ڕاستەوخۆ ( لکB ) |
|---|---|---|---|---|---|
| هەڵم نەگرتوویت | هەڵ | م | نە | گرتوو | یت |
| هەڵمان نەگرتوون | هەڵ | مان | نە | گرتوو | ن |
| هەڵت نەگرتووم | هەڵ | ت | نە | گرتوو | م |
| هەڵتان نەگرتووین | هەڵ | تان | نە | گرتوو | ین |
| هەڵی نەگرتوویت | هەڵ | ی | نە | گرتوو | یت |
| هەڵیان نەگرتوون | هەڵ | یان | نە | گرتوو | ن |

ج ـ وێنە بۆ ڕابوردووی تێپەڕی نائاسادە ( داڕژاو ) دوور :

— لە شێوازی ئەرێدا :

| ڕستە | پێشگر | ڕاناوی بکەر ( لکA ) | قەدی فرمان | ڕاناوی بەرکاری ڕاستەوخۆ ( لکB ) |
|---|---|---|---|---|
| دەرم کردبوویت | دەر | م | کردبوو | یت |
| دەرمان کردبوون | دەر | مان | کردبوو | ن |
| دەرت کردبووم | دەر | ت | کردبوو | م |
| دەرتان کردبووین | دەر | تان | کردبوو | ین |
| دەری کردبوویت | دەر | ی | کردبوو | یت |
| دەریان کردبوون | دەر | یان | کردبوو | ن |

ـــ له شێوازی نەرێدا :

| ڕسته | پێشگر | ڕاناوی بکەر (ك A) | نامرازی نـەفی | قەدی فرمان | ڕانـاوی بەرکاری ڕاستەوخۆ (ك B) |
|---|---|---|---|---|---|
| دامنەنابت | دا | م | نه | نـا | بت |
| دامانەنانن | دا | مان | نه | نـا | ن |
| داتنەنام | دا | ت | نه | نـا | م |
| داتاننەناین | دا | تان | نه | نـا | ین |
| دایەنابت | دا | ی | نه | نـا | بت |
| دایاننەنانن | دا | یان | نه | نـا | ن |

ب ـ وێنه بۆ ڕابوردووی تێپەڕی ناساده ( داڕژاو )ی تەواو :

ـــ له شێوازی نەرێدا :

| ڕسته | پێشگر | ڕانـاوی بکەر (ك A) | قەدی فرمان | ڕاناوی بەرکاری ڕاستەوخۆ (ك B) |
|---|---|---|---|---|
| هەڵمگرتوویت | هەڵ | م | گرتوو | یت |
| هەڵمانگرتوون | هەڵ | مان | گرتوو | ن |
| هەڵتگرتووم | هەڵ | ت | گرتوو | م |
| هەڵتانگرتووین | هەڵ | تان | گرتوو | ین |
| هەڵیگرتوویت | هەڵ | ی | گرتوو | یت |
| هەڵیانگرتوون | هەڵ | یان | گرتوو | ن |

ـــ لە شێوازی نەرێدا :

| ڕستە | پێشگر | ڕاناوی بکەر (لە A) | ئامرازی نەفی | قەدی فرمان | ڕاناوی بەرکاری ڕاستەوخۆ (لە B) |
|---|---|---|---|---|---|
| هەڵم‌نەگرتوویت | هەڵ | م | نە | گرتوو | یت |
| هەڵمان‌نەگرتوون | هەڵ | مان | نە | گرتوو | ن |
| هەڵت‌نەگرتووم | هەڵ | ت | نە | گرتوو | م |
| هەڵتان‌نەگرتووین | هەڵ | تان | نە | گرتوو | ین |
| هەڵی‌نەگرتوویت | هەڵ | ی | نە | گرتوو | یت |
| هەڵیان‌نەگرتوون | هەڵ | یان | نە | گرتوو | ن |

ج ـ وێنە بۆ ڕابوردووی تێپەڕی ناسادە ( داڕێژاو ) دوور :

ـــ لە شێوازی ئەرێدا :

| ڕستە | پێشگر | ڕاناوی بکەر (لە A) | قەدی فرمان | ڕاناوی بەرکاری ڕاستەوخۆ (لە B) |
|---|---|---|---|---|
| دەرم‌کردبوویت | دەر | م | کردبوو | یت |
| دەرمان‌کردبوون | دەر | مان | کردبوو | ن |
| دەرت‌کردبووم | دەر | ت | کردبوو | م |
| دەرتان‌کردبووین | دەر | تان | کردبوو | ین |
| دەری‌کردبوویت | دەر | ی | کردبوو | یت |
| دەریان‌کردبوون | دەر | یان | کردبوو | ن |

